رۆمان

د. نەوال ئەلسەعداوی

# ساتەوەختی ڕاستگۆیی

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
جیڤارا کەمال



# کاتێک پیـــاو دەدۆڕێت

لەسەر مێزەکەی کە کۆمەڵێک لە کاغەز و بڵاوکراوەی گرنـگ و ناگرنگی لەسەر بوو دانیشت .. شتێک لە ناخیدا پاڵی پێوە دەنا بۆ ئەوەی بچێتەوە ماڵەوە و حەمامێکی گەرم بکات و جلوبەرگەکەی بگۆڕیت و جلوبەرگی نوێ لەبەر بکات پێش ئەوەی بچێت بۆلای .. چـونکە ئەمشـەو ژوانـی هەیە لەگەڵیـدا .. ئەو ژوانەی کە زۆر درەنـگ لە کـاتی خـۆی هـاتۆتە پـێش و شـتێک تیایـدا ڕودەدات .. شتێکی تر جیاواز لەوانەی کە پێشتر ڕویانداوە .

سـەیرێکی کـاتژمێرەکەی کـرد .. حەوت بـوو .. ژوانـی لەگەڵیدا لە نـۆیە .. دوو کـاتژمێری لەبەردەمـدا مـاوە دەتوانێـت خـۆی بـۆ ئەو چاوپێکەوتنە یەکلاکەرەوەیە ئامادە بکات ..

چاوی مێزەکەی بەخێرایی داخست و بە هاوکارە گەنجەکەی ووت کە دەچێـت هەنـدێک کـاری گرنـگ ئەنجامـدەدات .. سـوار ئوتـومبیلەکەی بـوو .. بەرەو مـاڵەوە .. کلیلەکەی کـرد بە شـوێنی خۆیدا لە دەرگاکەدا و دووجار سوڕاندی و پاڵێکی بە دەرگاکەوە نـا کـردیەوە و هەوایەکـی ساردی شێدار بەر دەم و چـاوی کەوت کە بەردەوام ئەو هەوایە لە شـوقەکەیدا بـوو ، زسـتان و هـاوین نە بۆنەکەی و نە چڕی گۆڕانی بەسـەردا نەدەهات وێـڕای سـوڕانی ڕۆژ و مانگ و زەوی .. بەردەوام بە ساردی و شێداری لە شوقە تەنـگ و فراوانەکەیـدا دەمـایەوە تەنـگ بە دیـوارە تەنـگەبەرە بەرزەکـانی کە وەك شـورای ئەو قەڵا مێژوویـانەی تێربـوون بە خـواردنەوەی خـوێنی نەوەیەك لە مـرۆڤ و سـەدەکان .. و فـراوان بەو ژوورە ڕووتانەی ناومـاڵێکی کەمـی تیادابوو کە لە بێکەڵکـی و کۆنیـدا خۆیـان بە بنـاری دیوارەکـانەوە هەڵواسـیبوو .. وەك چەنـد پـارچەیەکی مێژوویـی وابـوون کە بە دیـواری یەکێـک لە ئەشکەوتەکانەوە هەڵواسرابوون ..

پێشتر بیری لە دیمەنی شوققەکەی و ناوماڵ و شێیەکەی نەکردبوەوە .. و لەوێدا پێشوازی لە هەموو نێچیرەکانی لە ئافرەتان دەکردوو لەسەر سیسەمە کانزاییە ساردەکەی شەوی لەگەڵ بەسەر دەبردن .. بەڵام نەیتـــوانی ئەوە لەگەڵ ئەو بکـــات .. بە ئاگـــابوو لەوەی کە بانگهێشتی نەکات بۆ شوققەکەی بەڵکو پێی وتبوو کە پێویستە ئەو بانگهێشـتی بکـات بـۆلای خـۆی نەك ئەو بێـت بـۆلای وەك بـاقی ئافرەتانی تر .

ڕایکرد بۆ حەمامەکە و ئاوگەرمکەرەکەی داگیرساند و جلی ناوماڵی لەبەرکرد .. و تاقمی ڕیشتاشینی هێناو لەبەردەم ئاوێنەکەدا وەستاو بە دەستی سـەرقاڵی ڕیشـی بـوو .. ئەو ئەم بەیـانیە تاشیوێتی بەڵام پێویسـتە دووبـارە بیتاشـێتەوە بـۆئەوەی نەرم بێـت وەك حەریـر . ژوانی لەگەڵ ئەودا وەك ژوانەکانی شەوانی پێشوو نیە .. بێگومـان مـاچی دەکـات و دەموچـاوی بەر ڕوخسـاری دەکەوێـت و پێویسـتە پێستی لووس بێت ..

سەرنجێکی ئاوێنەکەیدا و وردبوەوە لە تاڵە سپیەکانی سەری و تالَ تالَ بژاردنی وەك شەوانی تر کاتێک زانی کە ژمارەیان بیست و شـەش تـاڵە وەك شـەوی پێشـوو شـادمان بـوو .. بەڵام لە ناکـاو دڵـی خـورپەیەکی پـێکەوت کاتێـک دوو هێڵـی بەرزی بینـی لە ژێـر چاوەکـانیەوە .. ئەو دوو هـێڵە دوێنـی شـەو نەبـوون.. چەکمەجێکـی ژێر ئاوێنەکەی کردەوە و قتویەك کرێمی پزیشکی دەرکرد لەوانەی پێست پاراو دەکات و هێندەی دڵۆپێکی بەسەری پەنجە خستەسەری و هەر بە سەری پەنجە دەستیکرد بە یاریکردن و دەست هێنـان بەو دوو هێڵە تـا وایلێهـات وا هـاتە پێشـچاوی کە ئەو دوو هێڵە بەهۆی کاریگەری ئەو کرێمە جادوییە وون بوون و توانەوە..

لە چاوەکـــانی ورد بـــوەوە بینـــی ڕەشـــێنەکانیان کـــاڵ بـــونەتەوە .. سپێنەکانیشـــیان قەتمـــاغەیەکی زەرد داپیۆشـــیوە نائومێـــدی تیـــادا دەرخســـتون و کـــردونیەتیە دوو چـــاوی نەخۆشـــەکانی جـــگەر و

زەردوویی .. هەستی بە ترسێکی زۆرکرد و ڕایکرد بۆلای ڕەفەیەکی بچکۆلانە بە دیوارەکەوە شوشەیەك دەرمانی لێ داگرت و دوو دانەی لێ خوارد و خستیەوە شوێنی خۆی و شوشەیەکی تری ڕاکێشاو کەوچکێکی گەورەی لێ خواردەوە .. پاشان بە پارچەیەك لۆکە پێڵوەکانی و برژانگەکانی شۆرد .. و گەڕِایەوە بۆ ئاوێنەکە و سەیری خۆیی دەکرد .. و مەکینەی ڕیشتاشینەکەی گرت بە دەستیەوە و زۆر بە هێواشی و وردی دەستیکرد بە ڕیشتاشین .. و مەکینەی بە هەر جێگەیەکدا دەهێنا بە سەری پەنجە هەستی لەو جێیە هەڵدەگرت و دووبارە مەکینەکەی پێدا دەهێنایەوە تا بە تەواوی وەک حەریر نەرم دەبوو .

لە ڕیشتاشین بوەوە و نینۆکی دەستی و قاچەکانی کردوو جلوبەرگی خاوێنی دا بەسەر شانیدا و چووە گەرماو .

کاتژمێرەکەشی لەگەڵ خۆی بردوو بە بزمارێکدا لەناو گەرماوەکە بە دیوارەکەدا هەڵیواسی .. دەترسا لەوەی کە کاتی بیرچێتەوە کاتێک لە ئاوە گەرمەکەدا و لای سابونە بۆنخۆشەکەی دەبێت , ژوانەکەی بیر بچێتەوە لەگەڵی .. ئەوەی زۆر بەلاوە گرنگ بوو کە تەواو لە کاتی خۆیدا بگاتە لای . چونکە جارێکیان ئەوە ڕویدا و ماوەی چارەکێک لە کاتەکەی خۆی دواکەوت ، ئەو تەنها دەیویست چەند تامەزرۆی ئەوەیە بیبینێت هەر هێندە دوا بکەویت و لەوە زیاتر نەبێت .. بەڵام کاتێک گەیشتە شوققەکەی بینی تاریکە و پەنجەی لەسەر زەنگەکە دانا تا بێزار بوو و گەڕایەوە .. ئەو شەوە نەیزانی ئایا لە ماڵەوە بوە و بە ئەنقەست دەرگای نەکردەوە یان لەگەڵ کەسێکی دیکە چووبوە دەرەوە .. کاتێکیش لێی پرسی هیچ بەڵگەو بیانویەکی پێنەبوو و بێ هیچ سڵەمینەوەیەك پێی ووت بێزار بووم لە چاوەڕوانی ڕۆیشتم . کاتێک خەریکی خۆ شۆرین بوو بیری لەوە دەکردەوە و دەیوت تۆ بڵێی هەمان ئەو ڕوداوە لە ئافرەتێکدا ڕوبدات کە خۆشەویستی هەبێت ؟.. بڕوای نەکرد کە

خۆشەویستی نەکات .. چۆن بڕوا بەوە بکات کە ئافرەتێک هەبێت خۆشی نەوێت ؟ پێشتر بە سەدان لە ئافرەتان خۆشیان ویستووە و ئێستاش بە دەیان هەن خۆشیان دەوێت ، و ڕۆژانە چەندین هۆکار و ڕێگەچارەی نوێ دەدۆزێتەوە بۆ دەربازبوون لە دەستیان .. ئیتر چۆن ئەم ئافرەتە خۆشی ناوێت و ڕێزێکی زۆری لێ ناگرێت .. وەلێ کەواتە ئەو مێینەیە ئەمشەو ملکەچ دەکرێت ؟

ئەو بێگومان خۆشی دەوێت بەڵام ئافرەتێکی بە فیزە و شانازی دەکات بە مێینەیی هەر بۆیە دەشکێنرێت .

ئەو دیمەنەی هاتە پێشچاو کە بۆ یەکەمجار بینیبوی .. پێش دوو ساڵ لەوەوبەر .. لەنێو کۆمەڵێک لە پیاوان و ئافرەتاندا دانیشتبوو و چاوەکانی بەخێرایی بەسەریاندا دەگەڕا تا لەسەر ڕوخساری ئەو جێگیربوون . ڕوخساری شێوە جیاوازییەکی پێوە دیاربوو وەك لە ڕوخساری ئافرەتانی تردا کە نەبوو ، شێواز و ڕوخسارێکی وا کە پڕ بوون لە مێینەییەکی بەرفراوان ، بەڵام مێینەییەکی ڕۆشنبیرانەی بەرز وای لە پیاو دەکرد هەست بە نێرینەیی خۆی بکات و حەزێکی ئەوتۆی لا دروست بێت بۆ بەرەنگاربونەوەی و ملکەچ کردنی ..

ئەو لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو کە مل بە ئافرەتان کەچ بکات .. هێندەی چێژ وەرگرتبوو لەسەر ملکەچ پێکردن و توندوتیژ بوون لە گەڵیان نێرینەیی هێندە زاڵ ببوو توندی لەگەڵ ئافرەتان ببوە تایبەتمەندێتی یەکەمی .. ئەو هیچ چێژێکی لە دەست لەمل کردنی ئافرەت وەرنەدەگرت تا یەك دوو زللەی نەکێشایە بە دەم و چاویدا و بە قژ سەری دەخستە سەر زەویەکە تا لووتی لە زەوی دەدا دوای ئەوە ماچی دەکرد ..

ئەزمونەکانی لەگەڵ ئافرەتان فێری ئەوەیان کردبوو یەکەمین غەریزەی ئافرەت کە ڕزگاربوون لە دەستی مەحاڵە چەند ئازاد بێت و بەرز بێتەوە ، عەشقی ئەوەیە لە ژێر پێی گەورەکەیدا بێت کە

پیاوە .. تورەبوون و توندی و گەورەیی و هێزی دەپەرستێت .. و هێمنی و ناسکی و ئارامی لا قێزەونە..
ئەشـــکەنجەدان .. ئەو دەزووە حەریـــریەیە کە ئافرەتـــانی پێـــوە دەبەستێتەوە .. ئافرەت ئەو پیاوەی خۆشدەویت کە ئازاری دەدات .. ئیتر بۆچی ئازاری نەدات و ئەو دەزووە حەریریە نە ئاڵێنێت لە گەردنیەوە تا بە دوایدا بێت ؟
خەریکی شۆرینی پەنجەکانی قاچی بوو بە سابونە بۆنخۆشەکە.. وەك هەموو جارێک هەستیکرد پەنجە بچکۆلەی قاچی زیاد لە پێویست بچوکە و لە پەنجەی مرۆڤ ناکات لەبەرئەوەی ئەستور و خرِە .. وەك پەنجەیەکی نینۆکداری ئاژەڵێکی ماڵی وایە .. یان وەك چەکەرەیەکی پوکاوەی دارێکی بێ بەرە .. زۆرجار بێزار دەبوو لە جەستەی بە تایبەتی کاتێک تووشی هەڵامەت دەبوو کونە لوتەکانی زۆر پێ ناشرین دەبوو لە کەلێنێکی گەورەی دەکرد پێویستی بە پارچەیەکی یەدەکە پرِی بکاتەوە .. هەروەها لە ددانە زەردەکانی کە زۆرجار خوازیاری ئەوەبوو هەموویان هەڵکێشێت و ددانی نوێیان لە جێگە دابنێ ..
بەڵام ئایا دەبێت ئافرەتێک هەموو ئەو عەیبانەی ئاشکرا بکات کە خۆی دەیزانێت ؟ ئەو وەك تێگەیشتووە ئافرەت وەك پیاو نیە .. ئەو بە گشـــتی لە پیـــاو دەڕوانێـــت وەك گەورەیەك نەك وەك چەنـــد ئەندامێکی جەستەیەك .. پیاو لە چاویدا .. خودایە .. چێژ و خواردن و ژیانی دەداتێ ، ئیدی کوا بۆی هەیە لە جەستەی خودا ورد بێتەوە ؟ کوا بۆی هەیە لە ددانە زەردە شاشەکانی ورد بێتەوە کاتێک ماچی دەکات .. کوا بۆی هەیە سەرنجی پەنجەکانی قاچەکانی بدات کاتێک سەری دەخاتە نێوانیانەوە ؟ .. پێویستە چاوەکانی لێک بنێت .. هەموو ئافرەتان چاوەکانیان لێکدەنین .
ئەو لە ئافرەت تێگەیشتوە و ناسیونی بە درێژایی بیست ساڵ لە ماچکردنیان و دەست کردنە ملیان تا وایلێهاتووە بۆتە مامۆستا لە

خۆشەویستی و ئەوینبازیدا .. تەمەنـی گەیشتووە بە چل ساڵ و تـا ئێستا بیری لە هاوسەری بوون نەکردۆتەوە و بە سەدان جار ژنیشی هێنـاوە و سـەدان منداڵیشـی خستۆتـەوە .. هەنـدێکیان لەسـەر دەستی پزیشکەکان پارچە پارچە کراون و هەندێکی تریشیان لە ماڵەکاندا لە دوای شـوکردنی دایکەکانیـان لەگەڵیـان دەژیـن بێـئەوەی کەس بزانێـت تەنهـا ئەم و دایـکە نەبێـت و نـاوی پیـاوی دایکەکانیـان هەڵگرتووە.. زۆرجار سەردانی ئەو مێردانەی دەکرد کە زۆربەیان یان کەسوکاری بوون یان هاورِێیی .. و لە ڕوخساری ئەو منداڵانە ورد دەبوەوە کە هەمان ڕەنگی چاوی ئەمـی هەیە و بەرزی لـووتی هەمـان بەرزیـیە .. بەڵام هەرگیـز ئەو هەسـتەی نەناسـیووە کە بە باوکایەتی ناو دەبرێت ، بەڵکو سـەرنجی گێلـی ئەو بـاوکەی دەدا کە ناوەکەی خۆیداوە بەو منداڵە و هێندەی شەیتانێك چێژی لەو نەزانـی و گێلـیەی وەردەگـرت .. هەسـتی بە شـادومانی دەکـرد لە ئەنجـامی بەدەسـتهێنانی سـەرکەوتن بەسـەر پیـاوان و ئافرەتانـدا پـێکەوە .. هەرکاتێکیش بیری بەلای پێکەوەنانی ژیانی هاوسەرێتیشدا بچوایە دیمەنـی هاوسـەرەکەی دەهـاتە پێشـچاو لە باوەشـی پیـاوێکی جـگە لەخۆی .. منداڵانی دەهاتە پێشچاو لە ماڵەکەیدا دێن و دەچن و ناوی ئەویـان هەڵگرتـووە و لە پـارەی ئەو خەرج دەکەن و منـداڵانی پیاوانیکی تریشن ، پەستی دایدەگرت و هاوسەری بوونی بە توندی و قێزەونی ڕەتدەکردەوە و پیرۆزی و گەورەیی ڕەبەنـی ڕادەگەیاند ..

ئاوی گەرمی کرد بە جەستەیی و قاچەکانی .. هەستا و خـاولیەکەی داگرت .. و زۆر بە ئاگاییەوە جەستەی ووشك دەکردەوە .. لەبیری خۆیـدا دانـی بەوەدا نـا کە بەردەوام لە ژیانیـدا هەوڵـی سـەرکەوتنی داوە .. سەرکەوتن بەهەر شێوازێك و بەهەر بەهـایەك بێت .. گەر پیاوێک لە وتویژێکدا بەرەنگاری بـوایەتەوە و ڕاستیش بـوایە ئەوا توند دەبوو لەگەڵی کەﷲ ڕەقـی دەکرد بەرامبەری و دانەدەنیشت تـا

سەرکەوتنی بەدەست نەهێنایە .. و گەر حەزیشی بەلای ئافرەتێکدا بچوایە بە چەندین ڕێ و شوێن هەوڵی بۆ دەدا هەندێکیان گرنگی پێدان و هەندێکی تریان پشتگوێ خستن تا نێچیرەکە دەکەوتە بەردەستی ..

دەیزانی کە سەرکەوتن بەسەر ئافرەتدا ئەو کاتەیە کە جەستەی دەدات بە دەستیەوە .. ئەوکات دەیزانی کە هەموو چەکەکانی داوە بەدەستەوە و بەردەوام بە دوایەوە دەبێت و داوای سۆز و بەزەیی و گرنگیدان و ڕاستگۆیی لێدەکات و ئەویش بەو دەزووە حەریریە بەدوای خۆیدا پەلکێشی دەکات .. ئیدی چیتر بۆ ئافرت دەمێنێتەوە دوای ئەوەی جەستەیدا بەدەست پیاوەوە جگە لە خۆ پێدا هەڵواسینی هەتایی یان پەشیمانی و هەناسەساردی ؟!

ئەو هەرگیز بڕواشی بە پێکەوە لکان و خۆ هەڵواسینی ئافرەتان نەبوو بەڵکو بە هیچ پێکەوە لکانێك .. ئیتر بۆ ئافرەت تەنها دۆڕاندن و هەناسەساردی دەمایەوە . ئەویش هەستی بە سەرکەوتن نەدەکرد تا ئەوکاتەی ئافرەت بە فرمێسکەکانی قاچەکانی نەشۆردایە .. ئەوکات دەیزانی کە ویستی پیاوێتی بە ئەنجام گەیاندووە .. لەوێدا ئەرکەکەی لەگەڵیدا کۆتایی پێدەهات و بەشوێن نێچیرێکی تردا دەگەڕا بە هەمان ڕێگە و بۆ هەمان مەبەست ..

لەبەردەم ئاوێنەکەدا وەستاو قژە ماش و برنجیەکەی دادەهێنا.. و هەستی بە ئارامی کرد بۆ دواجار کلیلی ئافرەتێکی نوێ و خاڵە لاوازەکانی دەست کەوتووە .. ماوەی دوو ساڵی تەواو داوا و ماچەکانی ڕەت دەکردەوە ... تەنانەت بەرکەوتنەکانی دەستیشی ئەو هەژان و خورپەیەی لا دروست نەدەکرد کە کاتێک دەستی ئافرەتانی تری دەگرت دروست دەبوو ، بەڵام بێهیوا نەبوو ... لەگەڵی دادەنیشت و قسەی لەگەڵ دەکرد و بەردەوام سەرنجی ددانەکانی دەدا کە هەرگیز نە دەچوونە دڵیەوە لەگەڵ ئەوەی چاوەکانی و گوێچکەکانی پێ جوان بوو..

لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا توانی ئاڕاستەی سەرنجەکانی بگۆڕێت لە ددانەکانیەوە بۆ گوێچکەکانی و چاوەکانی .. هەروەها توانی بڕوای پێ بهێنیت بەو قسانەی بۆی دەکرد و گوێڕادێری بێت و هەستیکرد کە وردە وردە تێڕوانینەکانی بۆی نەرم دەبێت .. بینی مێینەیی وروژاوە لێی نزیکبوەوە و هەوڵیدا ماچی بکات ، بەڵام لێی دوورکەوتەوە و بە توندی و بە کبریاوە پێی ووت :

خۆشت دەوێم ؟ بە سەرسوڕمانێکەوە سەرنجیدا .. چۆن ئافرەتێک توانی ئەو پرسیارەی لێ بکات ؟ .. پێشتر هیچ ئافرەتێک باسی خۆشویستنی ئەمی نەکردووە بە مەرج پێش ئەوەی ماچی بکات .. ئەمیش لای خۆیەوە لێی پرسی : ئایا تۆ منت خۆشدەوێت ؟ ئەو دەیزانی کە پێویست ناکات ئەو پرسیارەی ئاڕاستە بکات چونکە گەر ئافرەتێک خۆشی نەوێت بڕیاری ئەوە نادات لەگەڵی دانیشێت و بیبینێت .. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ڕاشکاوانە و ڕاستگۆیانە وەڵامیدایەوە : نەخێر .. هێشتا نا .

هەستیکرد پەستانی خوێنی بەرز بوەوە و گەرم داهات .. خوازیاری ئەوە بوو زللەیەکی لێبدات ، بەڵام بێ سڵەمینەوە لێی پرسی : خۆشتدەوێم ؟ نەیتوانی لە گوڕ و تینێکی وەك ئەودا بێت لێوەکانی جووتکرد و بەبێ دەنگی مایەوە ، ئەو نەیدەویست وەك هەر پیاوێکی تر پیاوێتی خۆی سوك بکات و لەپێناو بەدەستهێنانی ئافرەتێک بە درۆوە بڵێ بەڵێ خۆشمدەوێیت ، تا ئەوەی دەیەوێت لێی دەستی بکەوێت .. سەرکەوتنەکانی پێشوتری لەگەڵ ئافرەتاندا فێری ئەوەیان کردووە کە درۆ نەکات ..چونکە ئەو پێویستی بە درۆکردن نیە... ئافرەتان دڵی خۆیان و جەستەیان دەدایە بێئەوەی خۆی بە هیلاك بەرێت لە قسە و باسەکانی خۆشەویستی ... وای لێهاتبوو ووشەی خۆشەویستی زۆر لای پیرۆزتر بوو لە دڵ یان جەستەی هەر ئافرەتێک ... سەری ئافرەتان لە نێوان قاچەکانیدا بێ هیچ بەرامبەرێك جێگیردەبوو .. بەبێ نرخ .. بێ بەڵێن .. بێ هیچ

شتێک .. بەڵکو هەندێکجار ئافرەتان نرخیان دەدایە تەنها بۆ ئەوەی پێیان لێ نەبڕێت و ئەو هەستە درۆینەیان بەخۆیاندەدا کە ڕۆژێك دێت بێتەوە لایان ..

کانتۆری جلوبەرگەکەی کردەوە و قاتێکی کەشخەی لەبەرکرد و شوشـەیەك بـۆنی گرانبەهـای دەرکـرد و دوو دڵـۆپی لە پەنـا گوێچکەکانیدا .

سواری ئوتومبیلەکەی بوو و لە ئاوێنە بچکۆلەکەوە سەیرێکی خۆیی کرد زۆر خۆیی بەدڵبوو .. هەستیکرد زاوایەکی نوێیە دەچێت بۆلای بوکەکەی ، لە شەوی زاوایەتیدا . هێنایە پێشچاوی خۆی لە ژووری پێشوازیکردن چاوەڕوانێتی .. لەوانەیە هەموو ئەمڕۆی لە گەرماودا بەسەر بردبێت ، قۆڵی و قاچەکانی شۆریبێت و شێلابێتی ، و لەوانەشە کراسێکی وای پۆشیبێت جوانیەکانی جەستەی دەرخستبن تیایدا .. بۆنیشی خۆشە بێگومان .. ئەو بەدەر لە توندی و کەڵلە ڕەقی مێینەیە .. هێنایە پێشچاوی خۆی دەستی لە ملیدایە و ماچی دەکات و جەستەی دەدات بە دەستەوە پاشان دەگری .. دوای ئەوەی خۆیان دەدەن بە دەستەوە هەموو ئافرەتان دەگرین .. هەستی بە شادومانی و گەشانەوە کرد کاتێک هەست بە فرمێسکەکانی دەکات ... چەند حەزی دەکرد تەنها فرمێسکێك ببینێت لەو دوو چاوە تیژە بێ ترسەوەی بێتە خوارەوە .. سەرە بچکۆلانەکەی هاتە پێشچاو لە نێوان قاچەکانیدا کەوتووە و تکاو پاڕانەوەیەتی کە جێی نەهێڵێت و بەزەییەکی پێیدا بێتەوە ، بەڵام ئەو نامێنێتەوە .. پاشان بۆ ڕۆژی دواتر داوای دەکات بە ووشکی و ساردییەکەوە وەڵامی دەداتەوە .. دووبارە داوای دەکاتەوە و دەیەوێت لەوە بگات کە ئایا بۆچی جەستەی بە تاڵان بردوو هەڵات .. ئەویش ناتوانێت هیچ شتێکی لەبارەی خۆیەوە پێ بڵێت .. نەیدەتوانی پێی بڵێت کە ئەو بە تەنها جەستەی نەدەویست بۆ خۆی چونکە ئەو هەڵاتووی دەستی چەندین لە جەستەی ئافرەتانە ، بەڵام ئەو دەیویست لە دوای دوو ساڵ لە

شەونوخونی و چاوەڕوانی سەرکەوتنی بە سەردا هێناوە .. ویستی مێینەیی قورسی چۆك پێ دابدات .. هەستی پێبکات کە بێدەسەڵات و برینـدارە لەدوای دۆڕانـدنی و لە خـۆ بەدەسـتەوەدانیدا دەتلێـتەوە و دەگـری بـۆ بێتوانـایی و تێکشـکاوی خـۆی .. دەیویسـت دەزووە حەریـریە کوشـندەکە لە گەردنـیەوە بئاڵێنێـت و بە دوای خۆیـدا پەلکێشی بکات .

گەیشتە شوقەکەیی و نەیتوانی سەرسوڕمانی بشارێتەوە کاتێـک بینـی .. وەك هەمـوو جارێـک کراسـێکی تـاریکی پۆشـیبوو هـیچ شوێنێکی جەستەی بەدەرەوە نەبوو ، قژیشی بێ هیچ گرنگی پێدانیك پەخشـان بـوو .. و هـیچ بـۆنێکی ئافرەتـانەی بەرلـووت نەکەوت ... لەبەردەمیـدا بە قـاتە کەشـخەکەیەوە دانیشـت و بـۆن و بەرامـی عەتـرەکەی لە شـوقە بچکـۆلانەکەدا بڵاوبـوەوە وایلێهـات شـەرم دایگـرت .. هەسـتیکرد لێـی ورد دەبێـتەوە لەگەڵ دەرکەوتنـی خەنـدەیەکی کەم لەسـەر لێوەکـانی ، و کـردنەوەی قسـەکردن بە گێـڕانەوەی یەکەم نـوکتە قۆستەوە و پێکەنینێکـی زۆر دایگـرت و سـەری کەوت بە پشتا وایزانـی هێنـدە پێدەکەنێت دەبـورێتەوە بەڵام بێـئەوەی هـیچ کـاریگەرییەکی هەبێـت خـۆی تێـک نەداو لەگەڵـی پێکەنی .

لەناکـاو لە پێکەنـین وەسـتاو سـەیرێکی کـردوو سـەری داخسـت .. نەیزانی ئەو سەر داخستنە چیبوو .. پێشتر لەو حـاڵەتەدا نەیبینیبوو .. وایزانی خەریکە شل دەبێت لێـی نزیـك بـوەوە و ویستی باوەشـی پێدا بکات و ماچی بکات بەڵام خۆی لێ دورخستەوە ، بێ سڵەمینەوە سەیری کردوو پێی ووت خۆشتدەوێم ؟ دووبارە سەری داخستەوە و بە دەستەکانی سەری بەرزکردەوە و هەرچۆنیك بێت لێوەکانی خستە سەر لێوی و ماچێکی قووڵی کرد .. پاشان لێوەکانی بەرداو لێی ورد بوەوە و پێی ووت : خۆشتدەوێم ؟ خەندەیەکی کردوو وتی : نەخێر .. هێشتا نا . قژی گرت و بۆ لای خۆی ڕایکێشا بەڵام ئەو بەرگری

کرد توانی بینیت بە سنگیەوە .. بواری هەناسەدانیشی بۆ نەهێشتەوە .. گوێی لێبوو لە ژێرەوە وێڕای ئەوەی دەیویست خۆی ڕزگار بکات لە دەستی پێی دەوت : خۆشتدەوێم ؟ لەوکاتەشدا هەستی زاڵببوو بەسەر کەڵە ڕەقیەکەیدا ، ووشەی خۆشمدەوێی لەلێو هاتەدەر لەگەڵ هەناسە برِکێی ، پێکەنی و بە چرپە پێی ووت خۆشتدەوێم ؟ وتی : نەخێر .. هێشتا نا . هیچ جۆرە بەرگری و هێزیکی پێ نەما و بە تەواوی خۆیدا بە دەستیەوە .

پاش کەمێک بە ئاگا هاتەوە .. چۆن هەستیکرد کە ئەو خۆیداوە بە دەستەوە ؟ دەبوایە ئافرەتەکە خۆی بدایە بە دەستەوە ؟ چۆن دەبێت پیاوێک هەست بکات خۆیداوە بەدەست ئافرەتێکەوە لەجیاتی ئەوەی ئافرەتەکە خۆی بدات بەدەست ئەوەوە ؟ هەستیکرد گەروی ووشك بووە ئەو ووشك هەڵاتنەی هەموو ئافرەتێک هەستی پێدەکات کاتێک خۆی دەدات بەدەست پیاوێکەوە و خۆشیشی ناوێت .

جگەرەیەکی داگیرساندوو بەبێدەنگی دەستیکرد بە کێشانی .. ئەویش بەبێدەنگی لەبەردەمیدا دانیشت .. ئەم ئافرەتە بۆچی قسە ناکات ؟ بۆچی وەك هەر ئافرەتێکی تر لەم جۆرە بارودۆخانە نایکاتە قەرەباڵخی و زۆربلێی ؟

تەنها چاوەکانی لێیان دەڕوانی .. لە ڕوانگەی هێز و کەڵە ڕەقیەوە .. وەك ئەوەی ئەو نەبوبێت ماوەیەك لەوەوبەر لە ئامێزیدا بوو .. وەك ئەوەی هیچ شتێک لە نێوانیاندا ڕوینەدابێت ، بەڵکو تێڕوانین و کەڵە ڕەقیەکەی زیادی کردووە.. هەستیکرد حەز دەکات زللەیەکی لێبدات و پێی بڵێت تۆ ئافرەت نیت .. تۆ پیاویت .. تۆ سوکایەتی بە مێینەییت دەکەیت .. بەڵام چۆن ئەو درۆ گەورەیە بکات و بەو خێراییەش ؟ ... دوریش نیە لەوە بگات کە پیاو لەو بارودۆخانەدا ئافرەت تۆمەتبار ناکات ، تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە هەست بە بێدەسەڵاتی بکات لە بەرامبەریدا یان ئەو کاتانەی نێرینەیی لا قێزەونە ...

جگەرەکەی تەواوکرد ، هەستایە سەرپێ و دەستی بۆ درێژکرد تەوقەی لەگەڵ کردوو بە خێرایی چووە دەرەوە وەك ئەوەی دێوەزمەیەکی بەدواوە بێت ..
ئەو شەوە وێڕای خواردنی چەندین حەبی خەو نەیتوانی بنوێت.. تا بەیانی لە مەراقدابوو . ئایا ڕاستە و دەبێت دوای ئەو تەمەنە زۆرە لە پاڵەوانێتی و ئافرەتبازی و بەدەستهێنانی ئەو هەموو سەرکەوتنانە بەسەر ئافرەتاندا . ئایا دەبێت دوای ئەم هەمووە دوو دڵبێت لە نێرینەیی و پیاوێتی ؟ بە گومانبێت لە جوانخاسی ؟ لە هێز و توانای ؟
ڕۆشنایی بەرەبەیان تاریکایی ژورەکەی ڕەواندەوە و ئەو هەر سەرنجی سەقفەکەی دەدا و دەیویست وەڵامی ئەو هەموو نیشانەی پرسیارانە بداتەوە کە خانەکانی مێشکیان تێکداوە و جێگای قوڵیان لە بیریدا کردۆتەوە ..
لە جێگەکەی هاتەدەرەوە و هەستی بە قورسی جەستەی کرد بەدوایخۆیدا پەلکێشی دەکرد .. تەلەفۆنەکەی بینی .. هەستیکرد حەزێکی زۆری هەیە بۆ تەلەفۆنکردن بۆی ... ئەو دەیەوێت جارێکیتر گوێبیستی دەنگی بێتەوە .. هەست بە حەزیك دەکات بۆ بینینی .. هەستێکی سەیر دایگرتووە و ناخی تەنیوە .. چەند جارێک تەلەفۆنەکەی بادا و دەنگەکەی بە خەواڵویی هاتە گوێ ، هیچ گرنگیەکی تیادا هەست پێ ناکات .. بەڵام گوێچکەکانی بەدرۆ خستەوە و شەوی ڕابردوی بەبیر هێنایەوە بە چەند ووشەیەکی بێسەرە و بەرە وەڵامیدایەوە گوێی باش نەیبیست و بە هیوایەکەوە لێی پرسی : خۆشتدەوێم ؟ ئەویش دوای ئەوەی باوێشکێکی دایەوە وتی : نا ، هێشتا نا..
دڵی چووە پێکانیەوە ، هەستیکرد ئەو برینەی لە دڵیدایە گەورە دەبێت و زیاد دەکات .. و حەز و هیواکانی ناخی زیاد دەکات .. نیشانەی پرسیارەکان لە مێشکیدا دەچنە قووڵایی ...

بە هیلاکـیەکەوە جلـوبەرگەکەی لەبەرکـردوو بەرە و نوسـینگەکەی بەڕێکەوت .. هەستیکرد هەموو شتێک ناشرین و زۆریش بێتامە .. هیـوای بـۆ هـیچ شـتێک نەمـاوە ... لەسـەر کورسـی و مێـزەکەی دانیشت و نەیتوانی سەیری هیچ وەرەقەیەکی بەردەمی بکات .. بە تیلەی چاو هەر مێشکی لای تەلەفۆنەکە بوو پڕ هیوا و نیگەران ... هەستیکرد حەزێکی زۆری هەیە کە دووبارە تەلەفۆنی بۆ بکاتەوە ... لەوانەیە ئێستا بە تەواوی خەو بەریدابێت و دەنگی باشتر بێت .. وایلێهاتووە هیچ شتێکی لێی ناوێت تەنها گێڕانەوەی بڕوابوون بە خۆی و نێرینەیی نەبێت ..

تەلەفۆنەکەی بـادا .. ئەمجـارە دەنگـی چـالاك و بزێـو بـوو ، بەڵام هەسـتیکرد ئەو چـالاکیە هـیچ پەیوەنـدیەکی بەمەوە نـیە ، بە پەرۆشیەکەوە پێی ووت : ئەمشەو دەمەوێت بتبینم ... بەڵام زۆر بە ئەدەبەوە داوای لێبوردنی کرد کە سەرقاڵە بە هەندێک ئیش وکارەوە ... تەلەفۆنەکەی دانـا و دڵـی لە ئازاردا خەریکبوو دەتەقـی .. ئەمە چیە ڕویداوە لێی ؟ ئەم تکـای لێدەکات و بۆی پەرۆشـە کەچـی ئەو خۆی لێدەشارێتەوە .. دەزووی ئازارە حەریریەکە لە گەردنی خۆی ئاڵاوە نەك لە گەردنی ئەو ...

نەیزانی بۆچی ئەوە ڕویدا ... بڕوای نەبوو کە ئافرەتێکی وەك ئەو هەبێـت .. چـونکە ئەویـش خـودی ئەوی نەدەویسـت بەڵکـو ملکەچکردنـی پیـاوێتی دەویسـت ... بیبینێـت لە خۆبەدەسـتەوادانیدا دەتلێتەوە و تکا دەکات و ددان بە دۆڕاندن و شکستدا بنێت .. دەزووە حەریریەکەی لە گەردنەوە بئاڵێنێت و بەدوای خۆیدا پەلکێشی بکات ئەویش وەك ئەم ئاڵای سەرکەوتنی بەرزکردۆتەوە بەهەر شێوەیەك بێت و بەهەر نرخێك ...

# لـە پێنـاو زانیـن

ئوتــومبیلە ســپیە بچکــۆلانەکە بە خێرایــی بە شــەقامەکەدا تیدەپەڕێت ، ئەویش سەری خستۆتە سەر لێواری پەنجەرەکە ، و شـنەی گەرمـی شـەو لە قـژی و جلـوبەرگەکەی دەدات و دەچێـتە ســەراتاپای جەســتەی هــاوڕێ لەگەڵ تێــڕوانین و ســەرنجە تێکشکاوەکانی بۆ نیل و نـاو بە نـاو بە تیلەی چاویشـی سـەرنجێکی ئەو پەنـجە گەورانە دەدات کە لە سـوکانی ئوتـومبیلەکەوە ئـاڵاون و چالاکـانە لێـدەخورێت ، و چـاوە شـینەکان بـرِاونەتە ڕێـگەکە و پەرۆشی گەیشتنن بە کۆتایی ڕێگە .

لە پەنجەرەکەوە سەری دەرهێنا تا هەوای گەرم بەر قژی و پێستی بکەویت ، گوێی لێی بوو لەگەڵ ئاوڕدانەوەیەکی خێرادا پێی ووت : کەمێکیتر دەگەین ..

بە شـادیەکەوە ووتــی وەك ئەو شـادومانیەی کاتێـک پیـاو هەسـتی پێـدەکات کە ئافرەتێـک خوشـی ویسـتووە و بـۆتە خـاوەنی .. شـنە شەوانەییە ناسکەکە خەندەیەکی لەسەر لێوەکـانی دزی و بۆ دووری برد و ووتی: شەوانی( حەلوان ) جوانە ..

بە نیگایەکی پڕ حەزەوە لێی ڕوانی و ووتی : تۆ لە شەو جوانتری ..

سۆزێکی ڕاستەقینە هەژاندی و لە چاوەکـانیەوە هەستی پێدەکرا بە ڕێز و ئەدەبەوە سەری داخست ، بینی دەستی سوکانەکە بەردەدات و بەشوێن دەستیدا دەگەڕێت بە سۆزێکی زۆرەوە دەستیگرت ..

کاتێک دەستی گوشی گوێی لێی بوو پێی ووت : خۆشمدەوێی بەبێ دەنگی لێوەکانی جووتکرد ..
بەڵام لێی پرسی : ئایا تۆ منت خۆشدەوێت ؟ ..
ئەویش لەو کاتەی تێڕوانینی چاوەکانی گواستەوە بۆ دەرەوەی پەنجەرەکە ووتی :
- ئایا ئەو گڵۆپانە دەبینی ؟
سەیری پێشی خۆیکردوو ووتی : گەیشتینە حەلوان ..

* * *

جانتا بچکۆلانەکەی هەڵگرتوو لە تەنیشتیەوە هەنگاوی دەنا و لە پێشیانەوە منداڵێکی بچووك دەرِۆیشت و لەبەردەم دەرگایەکدا کە ژمارەیەکی لەسەر بوو وەستا و بەڕێزەوە داموکایەوە چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە پێش ئەو بچنە ژوورەوە .
چاوی کەوتە سەر تەنها سیسەمێك کە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دانرابوو ، بەڵام گرنگی پێ نەداو چووە نزیك پەنجەرەکە و کردیەوە و ڕوانیە شەوی تار و ئاسمانی بریسکەدار بە ئەستێرەکان . لەو کاتەی هەوای گەرمی شەوی هەڵدەمژی هەناسەیەکی هەڵکێشا و ووتی :
- دیمەنەکە لێرەوە سەرنج ڕاکێشە !
هەستی پێکرد لە نزیکی وەستاوە و دەڕوانێتە ئاسۆی دوور .. بەڵام توانی ئەوە بگرێت کە چاوەکانی جار جار خۆیان دەدزنەوە بۆ سەر جێگەکە .
شانیدا بە پەنجەرەکەوە و نیگاکانی بۆ دوریان برد و گێرایانەوە بۆ قاهیرە .. بۆ ژورێکی لاکێشە .. و کتێبخانەیەکی بچکۆلانە .. ئەویش لەبەردەمیدا دانیشتووە .. لە نێوان لێوەکانیدا چەندین ووشەی پڕ لە مانا و تێڕوانینی تاسە ئامێز کە توانای کوشتن و لەناوبردنی سەرجەم هێز و لەخۆبایی بونەکانی هەیە و وایلێکردووە بگاتە ئاستی چەمینەوە لە ئەژنۆکانیداو سەری لە نێوان لەپە دەستەکانی بە

هەناسە ساردی و و هەموو سۆز و ئەوینێکی بە قەتیسماوی کە دەرفەتێکی دەربرِینی نیە  بە بێدەنگی بشارێتەوە .. تەنانەت لەو کاتانەی کە بۆلای خۆی پەلکێشی دەکات و هزری لە هزریدا دەتوێنێتەوە و وا هەست دەکات کە سۆزی ئەویش بە هەمان شێوە تواوەتەوە لە هزری ئەو و شادومانی ڕزگاربوون دەیگرێت ، بەڵام .. کاتێک لە ئامێزی دەردەچێت بە هەموو تواناى سەرجەم ئەوین و سۆزێکی وەك پێشوو لەگەڵ خۆی دەگێڕێتەوە بۆ خاڵی سەرەتا .. قەتیسما و وەك پێشوو .. وەك ئەوەی دەستبەرداری هیچکامیان نەبوبێت.. دووبارە حەزەکانی دەگەڕێتەوە ، لەگەڵیدا خەمۆکیەکانیش دەگەرِێنەوە ، دووبارە پرسیارە سەرسوڕهێنەرە بێ وەڵامەکانی بۆ دەگەڕێتەوە :

باشە بۆچی ئەو ؟

بۆ پیاوێکی تر نەبوو ؟ ئایا دەکرێت پیاوێکی تر بێت ؟ ئایا دەبێت بزانێت ؟!

*    *    *

دەنگی پیاوەکە لە گوێیدا زرنگایەوە و تێروانینەکانی لە ئاسۆوە گیرِایەوە ، بینی لە تەنیشتیەوە وەستاوە .. لە نێوان لێوەکانی چەندین ووشەی پڕ مانا هەیە ، لە چاوەکانیشیدا تێڕوانین و سەرنجی کوشندە هەیە بەڵام هیچ کاریگەرییەکیان نیە ... هەوڵیدا لە ئاست ئەژنۆکانیدا بچەمێتەوە ، ویستی بە هەناسە بڕکێش بێت چەند هەستێکی سۆزداری دەربڕێت بەڵام نەیتوانی ..

ڕایکێشا بۆلای خۆی ..

بینی قۆڵ و بازووە پتەوەکانی لە ئامێزیان گرتووە ، توانایان بەهێزترە لە قۆڵ و بازووی خۆشەویستێک ، ماسولکەکانی پتەوتر و توکنتر ، بەڵام کاریگەرییان بۆ هیچ شتێک نیە ..

*    *    *

ئوتومبیلە سپیە بچکۆلانەکە بە خێرایی بە شەقامە فراوانە نەرمەکەدا دەڕوات و ئەویش سەری خستۆتە سەر لێواری پەنجەرەکە و گەرمی شنەی ڕۆژێکی خۆرهەتاو لە قژی و جلوبەرگەکەیی و بە جەستەیدا دەڕواتە خوارەوە و هەستێکی پڕ چالاکی و نوێ لە ڕۆحیدا دروستدەکات تێڕوانینە خەواڵوەکانی لەسەر ڕووپەرِی نیل بە ئاگا دەهێنێتەوە و پێشی دەکەوێت بۆ قاهیرە .. بۆ ژوورە لاکێشەکە .. کتێبخانە بچکۆلانەکە .

لە پەنجەرەکەوە سەری دەرهێنا تا هەوای گەرم بەر قژی و پێستی بکەویت گوێی لێبوو ووتی : خۆشمدەوێیت ..

بە شادومانیەکەوە ووتی .. ئەو شادومانیەی کاتێک پیاو هەست دەکات ئافرەتێک خۆشی ویستووە و بۆتە خاوەنی .

شنەی خۆرهەتاوی گەرم خەندەیەکی لە لێوەکانی دزی و بۆ دووری برد . و بە تیلەیەکی پڕ سۆز سەرنجیدا .. پتەو بوو وەك جاران .. قەتیسماو وەك پێشووتر .. وەك ئەوەی دەستبەرداری هیچکامیان نەبوبێت ..

سۆزێکی ڕاستەقینە هەژاندی و بە ڕێز و سوجدە بردنێکی زۆرەوە سەری داخست بینی دەستی سوکانەکە بەردەدات و بە شوێن دەستیدا دەگەرِێت و بە هەست و سۆزێکی زۆرەوە گرتی و گوێی لێبوو لەو کاتەی دەستی دەگوشێت دەڵێت :

خۆشتدەوێم ؟

ئەویش تێڕوانینی چاوەکانی دەگوێزێتەوە بۆ دەرەوەی پەنجەرەکە و دەڵێت :

ئەو خانوانە دەبینێت ؟

سەیری پێشی خۆیی کردوو ووتی :

گەیشتینە قاهیرە ..

* * *

لە ژوورە لاکێشەکەدا .. لای کتێبخانە بچکۆلانەکە .. ئەویش لەبەردەمیدا دانیشتووە .. لە نێوان لێوەکانیدا چەندین ووشەی پڕ لە مانا و تێڕوانینی تاسە ئامێز کە توانای کوشتن و لەناو بردنی سەرجەم هێز و لەخۆبایی بونەکانی هەیە و وایلێکردووە بگاتە ئاستی چەمینەوە لە ئەژنۆکانیدا و سەری لە نێوان لەپە دەستەکانی بە هەناسە ساردی و هەموو سۆز و ئەوینێکی بە قەتیسماوی کە دەرفەتێکی دەربرِینی نیە بە بێدەنگی بشارێتەوە .. تەنانەت لەو کاتانەی کە بۆلای خۆی پەلکێشی دەکات و هزری لە هزریدا دەتوێنێتەوە و وا هەست دەکات کە سۆزی ئەویش بە هەمان شێوە تواوەتەوە لە هزری ئەودا و شادومانی ڕزگاربوون دەیگرێت ، بەڵام .. کاتێک لە ئامێزی دەردەچێت بە هەموو توانای سەرجەم ئەوین و سۆزێکی وەك پێشوو لەگەڵ خۆی دەیگێڕێتەوە بۆ خاڵی سەرەتا .. قەتیسماو وەك پێشوو .. وەك ئەوەی دەستبەرداری هیچکامیان نەبوبێت .. دووبارە حەزەکانی دەگەڕێتەوە ، لەگەڵیدا خەمۆکیەکانیش دەگەڕِینەوە ، بەڵام پرسیارە سەرسوڕهێنەرە بێ وەڵامەکانی بۆ ناگەڕێتەوە :بۆچی ئەو ؟

# چەخماخەیك لە ناوەوە

ئەو ماوەیەی لە نێوانیاندا بوو درێژییەکەی تەنها هێندەی درێژی قۆڵی دەبوو ، جگە لە هەردووکیشیان کەسێکیتر لە ماڵەوە نەبوو ، لەسەر مێزەکەی بەردەمیشیان بتڵێک لە خواردنەوە لە جۆرە باشەکان و سەهۆڵی وردکراو دانرابوو .. سەرنجی دەدا کاتێک پێکەکەی بە دەستەکانی دەگرت و پەنجەکانی تێوە دەئاڵاندوو و بە هێمنی دەیبرد بۆ لێوەکانی ..

بێدەنگ بوو .. بەڵام چاوەکانی تاوێك شادومانی تیادا هەست پێدەکرا و تاوێکی تر ئازار ، ساتێک پرشنگ دەداتەوە بە سۆزێکی سەرشێتانە ، ساتیکیتر دەکوژێتەوە بە عەقڵیەتێکی سارد و سڕ ،

ساتێک لە قوڵپی سۆزداریدا نوقم دەبێت و ، ساتێکی تر ووشك هەڵدیت لە بەگژدا چونەوەیەکی تونددا .

بەردەوامبوو لە سەرنجدانی لە کاتێکدا خەریکی خواردنەوە بوو پێك لە دوای پێك تا لە زۆری خواردنەوەی ( مەی ) سەر ڕوومەتەکانی سووربوونەوە و چاوەکانی شێوە بریسکەیەکی هەڵقوڵاو بە هەستەکانی تیادا زا .. هەستیکرد حەز دەکات پەنجەکانی بە شێوازێکی وا بگوشێت بیانشکێنێت و هاوار بکات بە سەریدا و پێی بڵێت : بەرەنگاربونەوەی نێو چاوەکانت ڕەقی و توندیم تیادا دەخولقێنێت .. یاخود پێکەکەی لە دەست وەربگرێت و لە پەنجەرەکەوە فڕێیدات و پێی بڵێت : ئایا ناتوانیت خۆشەویستیم لەگەڵ ئلوگۆڕ بکەیت بێئەوەی بیهۆش ببیت ؟ .. یان لە نزیك ئەژنۆکانیدا دانیشێت و سەر بکاتە سەر سنگی و بگری و پێی بڵێت : سۆزی چاوەکانت دەمگریەنێت .

بەڵام ئەو هیچی نەکرد ... بەبێدەنگی مایەوە و سەرنجی دەدا ... و شادومانیەکی شاراوە جەستە و دڵ و مێشکی ختوکە دەدا .. و هەموو شتێکیش لە دەرەوەی ئەم ژوورە بچکۆلانەیە بێ نرخە .. تەنانەت هونەرەکەشی .. ئەو هونەرە گەورەیەی کە هەموو ئارەزوەکانی تری ژیانی لە پێناویدا پشتگوێخست .. باشە بۆچی دەبێت هونەر بێ نرخ و قێزەون نەبێت ؟ ئایا نەیدەنوسی لەپێناو بەدەستهێنانی شتێک ... شتێکی وەك ئەم ساتەی کە ئێستا تیایدا دەژی .. ئایا ساڵانێکی زۆر نەینوسی تا ڕووبەڕووی ساتێکی وەك ئەم ساتەی ئێستا تیایدا دەژی ببێتەوە کە نوسین نەیتوانی بیداتێ یاخود بۆی تەرخان بکات ؟ ... هەموو مرۆڤێك لە دەرەوەی سنوری ئەم ئافرەتە لە ئێستادا بوونی نیە .. تەنانەت کچەکەشی ... کچە بچکۆلانەکەی کە خۆشەویستی ئەو وایکرد هیچ خۆشەویستیەکی تر لە ژیانیدا جێگەی نەبێتەوە ... ئەی بۆچی بوونی کچەکەی نەسڕێتەوە و فەنا نەبێت ؟ ئایا لەبەر ئەوە خۆشی نەدەویست چونکە

بەرهەمی خۆشەویستیەکی کۆنە و ئێستا خۆشەویستی نوێ هاتۆتە کایەوە و کۆنەکە دەسڕێتەوە و لەوانەشە بەرهەمێکی نوێشی پێ بدات ؟

سەرنجێکی چاوە تیژەکانیدا ... مەی نەیتوانیوە هیچ شتێک لەو تیژیانەیان بکات .. وەك ئەوەی تەنها دڵۆپێکی نەخواردبێتەوە .. سەرنجیدا لێوەکانی دەجولێن لە هەوڵی ئەوەی بیانەوێت قسە بکەن .. وەك هاندانێک بۆئەوەی قسە بکات خەندەیەکی بۆ کرد ... ئەو دەیەوێت شتێکی گوێ لێبێت هەرچەند نیمچە بە ئاگایەکە .. مێشکە بەهێزەکەشی نیوە خەوتویەکە .. بەڵام هیچی نەوت ... بەبێدەنگی خەندەیەکی کرد و پێکێکی تری تێکرد ...

نەیتوانی خۆی ڕاگرێت .. هەستیکرد بێئەوەی بیەوێت دەستی بەرز دەبێتەوە و پێکەکەی لێ وەردەگرێت ... لەو کاتەی پەنجە گەرمەکانی پەنجە ساردوسڕەکانی دەگوشێ پێی ووت : بەسە!. بەسەرسوڕمانیکەوە لێی ورد بووەوە و پێی ووت : تۆ خۆت بتڵە مەیەکەت هێنا . دەستبەجێ ئەو ساتەی بیرهاتەوە کە لەبەردەم مەی فرۆشەکەدا وەستابوو دوودڵ بوو لەوەی کە ئایا بتڵێک مەی بەرێت لەگەڵ خۆی یان نا ؟ هیچ کاتێک ئاوا دوودڵ نەبووە لە کرِینی مەی کاتێک ویستبێتی بچێت بۆلای ئافرەتێک .. بەڵام ئەو نایەوێت بە بتڵێک مەیەوە بچێت بۆلای .. بۆچی ؟ لەوانەیە وا هەستی کردبێت نەیەوێت بێ ئاگابێت .. یاخود لەهۆشخۆی دەچێت بێ نۆشینی مەی ... یان لەبەرئەوەی کاتێک لەگەڵی دادەنیشێت هەموو شتەکان قێزەون دەبن ... تەنانەت مەیش .. تەنانەت مەییش تام و واتا و کاریگەری لەدەست دەدات ... ئایا نەیخواردبۆوە ، لەگەڵ ئەوەشدا مێشکی بە ئاگایە و وریای جوولەی لێوەکانێتی .. هەر بریسکەیەکی نێو چاوەکانی .. ئایا هێشتا بە ئاگایە ؟ هەستە شاراوەکانی ناخی لێ نەهاتونەدەر ئەو هەستانەی مێشک دەیانوسیت و مەی بە چاپیان دەگەیەنێت و بێ بیرکردنەوە چی بوێت دەیکات .

گوێی لێیبوو پێکەنینێکی کورتی کردوو وتی : کاتێک وتت پاکەتە پسکیتە بڕوام پێکردیت . چاوت لێیە چەند گێلم !... خەندەیەکی شەرمنانە دایگرت .. بۆچی بەرگێکی شاراوەی کردەبەر بتڵە مەیەکە و خستبویە پاکەتێکی پسکیتەوە؟ لەوانەیە ویستبێتی پاکەتێک پسکیت بکڕێت لەجیاتی.. بەڵام ئایا ئافرەتێک چی دەڵێت کاتێک پیاوێک پاکەتێک پسکیتی بۆ بکڕێت ؟ ئایا شادمان دەبێت بە نەزانی و بێگەردی خۆی یان بە پێچەوانەوە ؟
کەمێک لێی نزیکبوەوە .. ویستی شتێک بڵێت ، بەڵام هیچی نەوت ... ئایا دەشێت ووشەی خۆشەویستی بتوانێت لێکدانەوە بکات بۆ ئەو زەمین لەرزەیەی مێشکی و دڵی و جەستەی دەهەژێنێت ؟ لێوەکانی بەبێدەنگی جوتکرد و پەستانی خستبووە سەر پەنجەکانی .. ئاە .. گەر مێشکی وون دەبوو لەبەردەم ساتوەختێکی سەرشێتی و لە ئامێزی دەگرت و پەستانی دەخستەسەر تا دەتوایەوە .. بەڵام دوودڵ بوو ... بۆچی دوودڵە ؟ ئایا لە چاوەکانیدا وەڵامی ئەو پرسیارەی لە ناخیدایە نابینێت :

- ئایا خۆشی دەوێم ؟ ...

بەڵام چەندین لێکدانەوە بە بەرچاویدا دێن و دەچن بێئەوەی وەڵامێکیان پێ بێت ... تێڕوانینی ئەویناوی دڵی دەجوڵێنێت .. تێڕوانینی بەرەنگاربونەوەش پیاوێتی دەجوڵێنێت ... مێیینەییەکی بەرین و هەستپێکراو لە پاڵ ئەو هێزەدا کە خەریکە لە هێزی پیاوێتی دەکات ؟ مێینەیی هەستێکی وای دەداتێ حەزکات پێوەی بلکێت .. و پیاوێتیشی کە هەمان هەستی لا دروستکردووە لێی هەڵدێت ... نا بەرابەری سەیر لە نێوانیاندا .. نا یەکسانی جادویی ... جادویی ژیان و نهێنیەکانی ، ئەو هەستە سەیرەش .. هەستی نا بەرامبەر .. حەزی پێوەلکان پێوەیی و هەڵهاتن لە دەستی .. بە شێوەیەك پێوەی دەبەستێتەوە . ئایا ئەویش وەك ئەو جادوگەرە ؟ ئایا هزری ئەویش نابەرامبەری لەخۆ گرتووە ؟ ئایا بە هەمان شێوە

توانیـویەتی گونجانـدن لە نێـوان پیـاوێتیەکی بەهێـز و مێینەییەکـی ناسـکدا بکـات ؟ .. پێشـتر ئـافرەتێکی بەو شـێوەیەی نەبینیـوە کە توانیبێتی کۆبونەوە لەنێوان ئەو دوانەدا بکات ... ئافرەت بریتی بوو لەوەی کە یان وەك مێینەیەک دەیویست پەیوەندی لەگەڵ ببیەستێت یـاخود هەڵبێـت لەدەست پیـاوێتیەکەی ... بەڵام حەزی پێوەلکـان و هەڵهـــاتنی هەبێــــت لە یەك کاتتـــــدا و زۆریـــــش ؟ ئەمە ئەو بەرەنگـــاربونەوەیە کە لە ناخیـــدا چەخمـــاخەیەکی دوودڵـــی لا دروســـتکردووە ... چەخمـــاخەی ئەو مێشـــکەی وون نابێـــت ... چەخماخەی ئەو ئەوینەی ئارام نابێتەوە ..

خەندەیەکی بەزەیی بەخۆیدا دایگرت لەو کاتەی لەناوەوە دەسوتێت بە چەخماخەیەکی سەیر کە هەلی گوێگرتنی لەو ساتەی تیایدا دەژی لەدەستدەدا .. ئەو پێشتر بە چەخماخەیەکی ناوخۆیی نەسوتابوو .. ئەو هەستی بە چەخماخە لەدەرەوە دەکردوو بە دەستی یان لێوەکانی دەیکوژانـــدەوە .. بەڵام چـــۆن پەنجەکـــانی بگـــات بەو چەخمـــاخە داگیرساوەی ناخی ؟

چـار نـیە لەوە زیـاتر کە دەبێت تـا کۆتـایی لەگەڵـی بژی .. بیکـاتە هاوســەری خــۆی ... هــزری لەگەڵ هزریــدا بەرامبەرکــاتەوە .. هەستیکرد دەڵێت : با هاوسەری پێکبهێنین !

بینـــی خـــۆی ڕێـــک کـــردەوە و فرمێســـکەکانی وەك ئاورنـــگ بە ڕومەتەکانیـــدا هـــاتنە خـــوارەوە و بە پەژارەیەکەوە ووتـــی : ئەی هاوسەرەکەت ؟ ..

ئاە .. هاوسەرەکەی بیرکەوتەوە .. کچەکەی .. بەڵام لە ئێستادا هیچ کەسێک لە دڵ و مێشکیدا نیە ...

بە سوربونیکەوە ووتی : تەڵاقی دەدەم ..

هێنـدەیتر خـۆی ڕێـک کـردەوە لە دانیشـتنەکەیدا ... دەسـتیکرد بە قسەکردن ... قسانێکی هۆشیارانەی ژیرانە .. بەڵام چەنـدە قێزەونە هۆشیاری و ژیری لە خۆشەویستیدا ! چەندیش مێشـک و عەقلَ

قێزەونە لە ساتی سەرشێتیدا ! گوێی لێیبوو ووتی : هاوسەرەکەت لەپێناو مندا تەڵاق مەدە .. کچەکەت لە دایك و باوکی جیا مەکەرەوە .

هەستیکرد حەز دەکات لە وەڵامی ئەو قسانەی زڵلەیەکی وای لێبدات ئەو مێشکە ناشرینەی بیری وای لە ئێستادا تیایە لێبکاتەوە .. ئەو درۆیە .. ئەو پیسیە .. ئایا دەشێت ڕاستگۆبێت گەر خۆشی بویم ؟ ئایا ئەوین زریانێك نیە لە ڕاستگۆیی و پیسی و سەرشێتی لەگەڵ تەوژمەکانی هەموو داواو ژیری و مێشکێک ڕاپێچ دەکات ؟!

ڕق و قینەکانی بە خەندەیەکی دەستکردانە ڕوپۆشکرد و بە ڕێزێکەوە ووتی : تۆ مرۆڤێکی گەورەی ، ژیر و هۆشیاریت .

بەبێدەنگی هەستایە سەرپێ و چاکەتەکەی لەبەرکردوو بە ڕێزێکی زۆرەوە ووتی : من دەڕۆم .

بە سەرسوڕمانیکەوە لێی ڕوانی .. دەڕوات ؟ بۆکوێ ؟ هەستیکرد چونە دەرەوەی لە ماڵەکەی شتێکی سەیری تیایە ... بێتوانا نەبوو و ماوەی سەردانەکەی کۆتاییهات .. ئەو .. ئەو پیاوی بوو . پیاوی ژیانی بوو .. مێردی بوو .. کوڕی بوو .. باوکی بوو .. ماڵەکەی ماڵی ئەو بوو ئایا لە ماڵەکەی بچێتە دەرەوە ؟ ئەی بۆ لای کێ بچێت ؟ هەستیکرد حەزێکی زۆری هەیە بۆ ئەوەی نەچێتە دەرەوە .. مێشکی وون بێت لەبەردەم ساتێکی سەرشێتیدا .. چەخماخەی دوودڵی ناخی چەخماخەی خۆشەویستی بکوژێنێتەوە .. بەڵام چەخماخەکە لە ناخیدا بوو .. پەنجەکانی نایگەنێ..

سەرسوڕمانی بە خەندەیەکی هێمنانە ڕوپۆشکردوو .. بەڕێزێکی زۆرەوە تەوقەی لەگەڵ کردوو چووە دەرەوە .

# ئــەو دڵــەم کــە لێی یــاخی بــووم

چاوەکـانم کـراوەن لەگەڵ ئەوەشـدا نـابینن ، تاریکـاییەکی چڕ و ترسناکیشە . ڕێگەکەش تەنگ و گەرمە .. هەناسەکانیشم لەسەرخۆ و خنکاوە .. جەستەم قورسە .. بێ جووڵەیە .
ئایا دەبێت نەهامەتیەك هەبێت لەمە زیاتر ؟
ئایا دەشێت ژیان لەمە زیاتر بێتام بێت ؟
کاتێک مرۆڤ چاوەکانی لەدەست دەدات .. لەگەڵ ئەوەی دووچاوی هەن .. کاتێک تاریکایی باڵدەکێشێت بەسەر ڕۆژی ڕووندا ؟!
ئەو یەکێـک بـوو لەو ملیۆنـانەی بەبەردەممـدا گوزەرانیـان دەکـرد و من تەنها هەر ئەوەندم بەبیردا دێت کە ئەوانە مرۆڤن .
بەڵام ئەو ویسـتی چـاوە یاخیەکـانم بەرە و لایخـۆی ڕاپـێچ بکـات.. ویستی .. لەمرۆڤیش تەنها تواناو ویستی شك دەبرد ..
بۆ ساتێک چاوەکانم لەسەری جێگیر بوو .

لـووتە کـورت و نـزمەکەی هەسـتێکی وامـدەداتێ کە دڕندەیە .. لێوەکانیشی بازنەیی و بۆ سەرەوە وەك برۆی ئافرەتێکی دڕندە .. چاوەکانیشی توندڕەوانە زەردییەکی لێڵ و تێکەڵ بە سپیایەکەی بوو .. من ڕووم لێ وەرگێڕا بەڵام ئەو لایکردەوە بەلامدا ..
جێگەکەم جێهێشت وەک سێبەر دوامکەوت .. کەوتە سەر ئەژنۆ و بە فرمێسـکەکانی زەویـیەکەی بەردەمـی تەڕ کـردوو باسـی خۆشەویستیەکی گەورەی بۆ کردم ..
دڵم بڕوای پێ نەهێنا و ڕەتیکردەوە .. بەڵام مێشکم بڕوای پێکرد .. ئەو پیاوە .. دەوڵەمەند .. سەرکەوتوو .. لێهاتوو .
دڵم نیگەرانبوو لەدەست مێشکم .. تێگەیشتن و هەڵسوکەوتی بەلاوە قێزەون بوو .. قینی لە ژماردە و پێوانە و پێداچونەوەکانی بوو .. مێشکم هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو لەبەردەم توانای زلهێزی دڵمدا .. هەربۆیە وەك منداڵێکی هەتیوو دەچەمێتەوە لەناو قەفەزەکەی خۆیدا و چاوەڕوانی نەهامەتی دەکات ..
من بەردەوام شوێن دڵم دەکەوتم .. نیگەرانیش دەبووم .. هیلاك دەبووم .. بێ خەرجی دەبووم .. برسی دەبووم ، بەڵام تەنها جارێکیش بەبیرمدا نەهاتووە لە داواکارییەکی دڵم دەرچم..
بۆچی ؟! نازانم ..
بەڵام سوربووم لەسەر ئەوەی ئەمجارەیان لە ویستی دەربچم لەگەڵ ئەم پیاوەدا . دواجار ئەم جارەیان مێشکم تاقیبکەمەوە ..

* * *

لە بەردەمیدا دانیشتم و هەوڵم دەدا لە ڕوکاری قوڵایی نیل وورد ببمەوە لە جیاتی سەرنجدانی چاوە لێڵەکانی ئەو .. ئەمویست لە ووشە بەتاڵە بێکەڵکەکانی شتێکی بە واتا هەڵەنجێنم ..
باسی لە بازرگانی دەکرد .. داواکارییەکانی بازاڕ . چۆن کڕیار ڕاو دەکات تاکو هەرزانترین شتی بە گرانترین نرخ پێ بفرۆشێت .. ئەمەی بە هونەر و ژیری ناو دەبرد .. هەستمکرد دڵم لە ناوەوە

لە قێزەونـی و بێزاریـدا دەکولێـت .. بەڵام مێشـکم پێشـم دەکەوت و سامان و پارە و سەرکەوتنەکانی بەبیر دەهێنامەوە ..
هەربۆیە پێویستە دڵم ڕابهێنم لەسەر ڕێزگرتنی هونەری بازرگانی ..
لە ئوتومبیلە کەشخەکەیدا لە تەنیشتیەوە دانیشتم و چاوەکانم لێکنا تا لەگەڵ خەونەکانی مێشکمدا بڕۆم بۆ دوور ..
دەوڵەمەندی چەند جوانە ! چەند خۆشە سوار ئوتومبیلێکی کەشخەی فراوان ببم وەك فڕۆکە بە شەقامەکانی قاهیرەدا بمگێڕێت ! .. بەڵکو چەند خۆشە ببمە خاوەنی ئەم ئوتومبیلە و خاوەنەکەشی ! ..
دڵم قێزەونی دەردەبڕی لە خەونەکانی مێشکم ..
من ؟ من بیر لە هەبوون دەکەمەوە ؟ لە بردن و وەرگرتن ؟ منێك کە بەردەوام دەمبەخشـی و دەمـدا .. شـادومانیم ئەوە بـوو کە دەمبەخشی و دەمدا ؟ ..
بەڵام ئایا پێدان و بەخشین چی بۆ کردم ؟
من نیگەران دەبووم .. هیلاك دەبووم .. بێ خەرجی دەبووم .. و برسی دەبووم .. دەبا ئەمجارەیان وەرگرتن تاقیبکەمەوە .. خۆم فێر بکەم وەربگرم و وەربگرم ..

*   *   *

بینیم لێم نزیك دەبێتەوە و بە دوو چاوە لێڵە شێواوەکانیەوە لێم وورد دەبێتەوە و دەستی گرتم ، دڵم لە قینـا ڕاپەڕی .. بەڵام مێشـکم بە هێمنی و لەسەرخۆ ڕووبەڕووی بۆوە و .. بێدەنگ بوو ..
زیاتر لێم نزیکبوەوە و هەستمکرد لێوەکانی کە بەرز بوبوونەوە بۆ سەرەوە وەك بڕۆی ئافرەتێکی سۆزانی بەر لێوەکانم دەکەوێت ..
دڵم بە قێزەونیەکەوە ڕەتیکردەوە .. بەڵام مێشکم تایبەتمەندیەکانی بیرهێنـامەوە .. ئەو دەوڵەمەنـدە .. و دەوڵەمەنـدیەکەی دەبێـتە دەوڵەمەندی منیش ..

ئەو گـێلە .. لەبەر ئەوە لە فیـزی زیرەکەکـان چاوپۆشـیم لێـدەکات. نەمویست سەرنج بدەمە چاوەکـانی یـان لێوەکـانی . هەوڵـم نەدا زۆر گوێ شل بکەم بۆ قسەو جووڵەکانی ..

بـۆیە دڵـم بە گێـل و سـاویلکە تۆمەتبـار کـرد .. ئەو دڵەی بـڕوای بە شتانێکی بێ مانا و بێ نرخ هەیە ..

دوو چـاوی قـوولَ ! .. بیـر و بۆچـونیکی ژیـرانە ! .. هەسـت ! .. خودێکی هونەرمەند ! .. ڕەسەنایەتیەکی ڕۆحی ! ..

بەڕاستی شتانێکی بێواتان .. تەنها خەیاڵێکی ساویلکەیە دڵم هەستی پێـدەکات بەبـێ بـونێکی ڕاسـتگۆیانە لەسـەر زەوی و بـێ بەڵـگە و پێوانە جگە لە هەستە توندڕەوە دڕندەکانم نەبێت !

چاوەکـانم لێکنـا .. گوێچکەکـانم و ئەوانەی دڵێشـمم داخسـت .. لێـوم دایە ..

بە دەنگێکی پێکەنیناویەوە ووتـی : خۆشت دەوێم ؟

خەریکبوو دڵم هـاوار بکـات و بڵێت : نەخێر نەخێر . بەڵام مێشـکم بازیدایە بەردەمی و ووتـی : بەڵێ !

بە دەنگێکی ناخۆشەوە ووتـی : شووم پێ دەکەیت ؟

دڵـم ویسـتی پێـی بڵێت : هەرگیـز هەرگیـز .. بەڵام مێشـکم ڕێـگەی لێگرت و ووتـی : بەڵێ .

*     *     *

مێشکم لەسەر تەخت پاڵیدایەوە بە سـەرکەوتنی و چـاوەڕوانی دارو دیواری جوان و بەرز و نەخشێنراو بۆن و بەرامی چەندین جۆر لە خــواردنی دەکــرد . چاوەچــاوی جلــوبەرگێکی زۆر و گرانبەهــای دەکرد .. هەستی بۆ سیسەمی گەرم ونەرمی گران هەڵدەگرت .. لە و ئوتومبیلە درێژە ورد دەبوەوە کە لەبەردەم کۆشکدا دەستەونەزەر وەسـتاوە لە چاوەڕوانیـدا .. بەڵــێ .. ئەمەیە ژیــان .. ئەو ژیــانەی دەهێنێت بژیت لە پێناویدا .. ئایا هەموو ئەو شتە گرانبەها و بەنرخ و دەگمەنانە دەکوژێت لەپێناو چەند لێکدانەوەیەکی خەیاڵاوی دڵت ؟!

فێربە ئەم شتانەت خۆش بوێت .. ئەم خۆشگوزەرانیەت خۆش بوێت .. هەستەکانت بەم خۆشیە نوێیانە ڕابهێنە ..
کاتێک ئەم شتانەت نەبوو بە چ شتێک قایل بوویت ؟!
چەند ووشەیەکی وونی بێکەڵکت پێ باشترە لە ژەمە خواردنێکی پڕ سوود .. ترپەیەکی دڵت پێ باشترە لە هەژانێکی هەستپێکراوی ڕاستەقینەی جەستە .. فێر ببە عەشقی جەستەت ببە ، و هەستەکانت تێر بکەیت .

*   *   *

لەسەر مێزە گەورەکە دانیشتم کە چەندین جۆر خواردنی بەتامی لەسەربوو .. خواردم و خواردم .. کانتۆری جلوبەرگە گرانبەهاکانم کردەوە .. خۆم گۆڕی و چەندین جۆرم جلوبەرگ پۆشی .. سواری ئوتومبیلە درێژەکە بووم .. پێی سوڕامەوە و سوڕامەوە .. درێژبووم لەسەر سیسەمە نەرمە فراوانەکە .. نوستم و نوستم .. گێژاوێکی گەورە بەئاگای هێنامەوە و دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو کاسی کردم .. و ڕۆشنایی لەسەر چاوەکانم لادا .. هەستەکانمی خەفە کرد .. هەستمکرد من جۆرێکی سەیرم لە ئاژەڵ و لەسەر دوو پێ دەڕۆم .. سەرنجێکی خۆممدا لە ئاوێنەکەدا ڕوخسارێکی سەیرم بەخۆمەوە بەرچاوکەوت .. گۆشتن و ڕوپۆش بە جۆرەها بۆیاغ بەتاڵ لە هەست و هۆش .. دوو چاوی کوژاوەی بێئاگا وەك چاوی بۆق .. دوو لێوی وشکهەڵهاتوو توانای خەندە کردنیان نیە ..
نەمتوانی لە دەموچاومدا ڕوخساری ڕاستەقینەی خۆم بدۆزمەوە .. خودی خۆمم لێ ونبوو .. کەسایەتیەکی لاوازی جگە لە خۆمم دەبینی .. هەستم بە جەستەیەکی ئەستوری قورس کرد هیچ شێوەیەکی جەستەی منی تێدا نیە .. وەك ئەوەی هەموو شتێکم لێ وون بوو بێت .. ڕۆشنایی چاوەکانم.. خەندەی ئاسایی و سروشتی سەر لێوەکانم ..

هیچ شتێک دڵم ناداتەوە .. هیچ شتێک هیوام پێ نابەخشێ .. دڵم بۆ هیچ شتێک لێ نادات و بە هیچ شتێکیش دڵم خۆش نیە..
دڵم ڕۆیشت و لەگەڵی بڕوام بە بوونم و ژیان ڕۆیشت ..
بینیم بەرە و لام دێت ..
ئەم پیاوە ناشرینە بیگانەیە کێیە وا لە ژووری نوستنەکەم هەڵدەکوتێتە سەرم ؟ ..
گوێم لە دەنگە گڕە ناخۆشەکەی بوو دەیوت :
- ئەمڕۆ پارەیەکی زۆرم دەستکەوت .. ریخۆڵە کوێرەیەکم بە 100 جونیە لێکردەوە ..
- تۆ ئەو نەشتەرگەریەت تەنها بە (50 ) جونەیە دەکرد .. بۆچی نرخەکەت زیاد کردووە ؟ ..
- ریخۆڵەیەکی ئاڵۆز بوو ..
سەرنجێکیمدا .. بینیم لوتێکی کورتی بچووکی هەیە هەستێکی وامدەداتێ کە زۆر هیچوپوچە .. دوو لێوی بازنەیی بۆ سەرەوە وەك برۆی ئافرەتێکی سووك و بێ نرخ .. دوو چاوی لێڵی زەرد هەڵگەڕاو وەك چۆن زەردێنەی هێلکە لە سپیایەکەیدا لێڵ دەبێت و تێک دەچێت ..
بۆچی بڕوام بە دڵم نەکرد ؟
دڵم ڕاستگۆ و بێ پێچ و پەنا بوو .. مێشکم بێ خێر و هیچە .. مێشکم دایە بەر بۆچونی قێزەونی و بێکەڵکی و ئەویش خۆی حەشاردەدا لەناو کەللە سەرە تەنگ و تاریکەکەمدا پەشیمانە لە بەدەستهێنانی ئەو سەرکەوتنە قێزەونە .. بەڵام نەیەت بەبیرتدا کە سەرکەوتوویت .. وا نەزانی لەسەر تەختم چوار مشقی پاڵتداوەتەوە ..
فڕێت دەدەمە خوارەوە !
بە ئەنقەست ویستم مێشکم زەلیل و ڕیسوا بکەم و بۆیەش هەموو شتێکم وەلاوە نا .. کۆشك و ئوتومبیلەکەم جێهێشت .. مێزە پڕ

خواردەمەنی و سیسەمە فراوانەکەم جێهێشت .. تەنانەت جلوبەرگ و پێڵاوەکانم و پارەکانم و پێناسی خێزانیشم جێهێشت .. بە دەنگە ناخۆشەکەیەوە پێی ووتم : بۆ کوێ ؟ ..
- بۆ ماڵەکەم ..
- ئەی ئەمە ؟
- ماڵی من نیە .
چی بەسەر مێشکتدا هاتووە ؟ ..
وازم لێهێناوە ..

* * *

چاوەکانم کراوەن لەگەڵ ئەوەشدا نابینن ، تاریکاییەکی چڕ و ترسناکیشە . ڕێگەکەش تەنگ و گەرمە .. هەناسەکانیشم لەسەرخۆ و خنکاوە .. جەستەم قورسە .. بێجووڵەیە .
ئایا دەبێت نەهامەتیەك هەبێت لەمە زیاتر ؟
ئایا دەشێت ژیان لەمە زیاتر بێتام بێت ؟
کاتێک مرۆڤ چاوەکانی لەدەست دەدات .. لەگەڵ ئەوەی دووچاوی هەن .. کاتێک تاریکایی باڵ دەکێشێت بەسەر ڕۆژی ڕووندا ؟!
منیش وەك ونبویەك دەڕۆم .. بە شوێن شتێکی خۆشەویست و گرانبەها لەخۆمدا دەگەڕێم .. هەوڵدەدەم بیدۆزمەوە .. تا بیگێڕمەوە سەر تەختەکەی .. تا دوای بکەوم و دوای کەوم و دوای کەوم .. بۆ ئەوەی نیگەران ببم .. هیلاك ببم .. بێ خەرجی ببم .. برسی ببم .. بەڵام شتێک دەبێت دڵم بداتەوە.. شتێک هیوایەکم پێ ببەخشێت .. پەلکە زێڕینەیەك لە شادومانی دروست بکات و بەدەر لە هەموو شتێک لاپەڕەی ژیانم ڕەنگاوڕەنگ بکات .. وا بکات خەندەی سروشتی ئاسایی بێت لەسەر لێوەکانم .. ڕۆشنایی بخاتە چاوەکانم و بڕوام بە بونم و ژیانم توند بکات .. نەمرێت .. وام لێبکات بژیم .. بەرگەی ژیان بگرم ..

من دەڕۆم .. بە شوێنیدا دەگەڕێم .. ئایا .. جارێکیتر دەیدۆزمەوە ؟
.. نەخێر دەزانم .. پێویستە ! ..

# مـــام عوسمـــان

چاوەکـانی خۆیـان هەڵواسـیبوو بە ئاڕاسـتەی ئەو تیشـکانەی لە مانگە هیلالیەکەوە شۆڕ بوبوونەوە لە تاریکایی شەودا ، هێندە نابات لە ناو چلَ و چێوی دار و درەختەکاندا هەموو دەشکێنەوە و پارچە پارچە دەبن ، پاش کەمێک یەکتر دەگرنەوە و کەمێک بەرزدەبنەوە تا بچنەوە ئاسمان وەلێ دادەگەڕێن و تێکەڵ بە نیل دەبن و لەسەر ڕووکـاری ئـاوەکەی خۆیـان دەدەنە دەسـت جـووڵەی شـنە بـای

سەرشێت .. وەك ئەوەی حەز بەو بەرکەوتنە بکات کە خۆ نقوم کردنە لە ئاوی ساردی نیلدا و خۆشۆرینە تیایدا لەگەڵ لێدانی شنە بای شەوانی گەرمی قاهیرە .
چاوەکانی نیمچە خەوتویەك بوو لە چاوە چاوی ئەو پرشنگە درێژ بوانە و شادومانیەك و بێدەنگیەك باڵی کێشابوو بەسەریدا ... هەستی بە ساردی ئاوەکە کرد لە جەستەی گەرمیدا و هەستی بە شادیەك کردوو حەزی دەکرد کە جلوبەرگەکەی دانیت و خۆی بخاتە ئامێزی ئاوەکەوە ..
بەڵام بێ جووڵە کردن لەسەر کورسیەکەی مایەوە و سەرنجی ئەو دیمەنەی دەدا و خەیاڵێکی خۆشی هەبوو لەگەڵیدا .. لە ناکاو ئاستی بینینی کەمبوەوە وەك ئەوەی کارەبای بینینی لێ بچڕێنرابێت ، ئەویش لە دەنگی چرکەی کاتژمێرەکەی زانکۆ کە لە دوورەوە دەهاتە گوێی ، کارەبای گوێچکەکانی کەوتنەکار و چرکەکاکی چرکە چرکە دەبژارد .. هیوا و ترسیش هەردووکیان بەیەکەوە وایان دەهێنا بە خەیاڵیدا کە دەنگەکە لە دوای دوا چرکەوە کۆتایی پێدێت ،بەڵام چرکەیەکی تر هاتە بەرگوێی و دڵی هاتۆتە سەر قاچەکانی ... لێدانی چرکەی کاتژمێرەکە بەردەوام بوو وەك دێوەزمەیەکی برسی و تا دوانزە جاری تەواو ..
لێرەدا بە ئاگا هاتەوە و ڕۆشنایی کەوتەوە چاوەکانی و ڕاستیەکانی بە چاوەکانی خۆی بینی .. ڕاستیە تاڵەکان .. شوشەی بیرە بەتاڵەکانی بینی و لە تەنیشتیشیەوە دوو پەرداخی بەتالَ و ژێرەوە مێزیکی پیسی قێزەون و چاوەکانی کەوتە سەر پێڵاوە ڕەشەکانی و دیمەنەکەی زۆر بەلاوە سەیربوو .. سەری هەڵبڕی بینی چاوە بریسکەدارەکانی لێی ورد دەبنەوە بەبیریدا هاتەوە .. بەڵێ ئەوە .. خۆیەتی .. بەڵام بۆچی پێڵاوەکانی وەك ئەوە وایە پێڵاوی پیاوێکی تربێت ؟ .. بۆچی پەنجەکانی دەستی بەرز و باریکە وەك ئەوەی پەنجەکانی ئەو نەبن ؟

گوێی لە دەنگە گەرمەکەی بوو دەیوت:

- ئایا چرکەی کاتژمێرەکە بەو ئاستە ترساندیتی ؟ چی نیگرانی کردویت ، دواکەوتویت ؟

جەستەی لەرینەوەیەکی کردوو ووتی :

- زۆریش . لەو بڕوایەدا نەبووم کات بەو خێراییە تێپەڕێت .من وامدەزانی کاتژمێر دەیە .

خەندەیەك هاتە سەر ڕوخساری ئەو خەندەیەی کاتێک پیاو بێ پەردە خۆشەویستی خۆی ئاشکرا دەکات و تیایدا هەستکردن بە کات و هەستەکان نامێنێت و دڵنیای کردەوە و ووتی :

- خێزان هەموو گەشتیان کردووە بۆ ئەسکەندەرییە و لە ماڵەوە هیچ کەسێکت لەگەڵدا نیە جگە لە خزمەتکارە بەساڵاچووەکە ، لەوانەیە لە کاتژمێر نۆوە نوستبێت .. ئافرەتانی بەتەمەن جگە لە خەوی قووڵ چێژ لە هیچ شتێکی تر نابینن ..

وەڵامیدایەوە و ووتی :بەڵێ ئەمە ڕاستە ، بەڵام ..

ووتی : بەڵام چی ؟

دەستبەجێ وێنەی مام عوسمانی هاتە پێشچاو بە سمێڵە چڕەکەیەوە کە وەك ئاژەڵێکی کێوی وایە بەسەر لێوی سەرەوەی ، دەموچاوە ڕەشە بریسکەدارەکەی و دوو لێوە شین هەڵگەڕاوەکەی و ددانە سپیە گەورەکانی ..

جەستە بچکۆلانەکەی ڕاپەڕی و بە دەنگێکی هێمنەوە ووتی : بەڵام مام عوسمان بە درێژایی شەو بەخەبەرە وەک خەڵکی نانوێت ، و دەمبینێت کاتێک نیوەی شەو بگەڕێمەوە .

دەنگی قاقایەك لەو شەوە بێدەنگەدا هاتە بەرگوێی و سەری بەپشتدا کەوت وەك دڵنیابونێك و خەیاڵ ئاسودە بونێك : مام عوسمان ؟ مام عوسمان چ پەیوەندیەکی بە تۆوە هەیە ؟ ئەو تەنها دەرگاوانە و هیچ پەیوەندیەکی بە ژیانی تۆوە نیە ، لە سەرەتای شەودا بگەڕێیتەوە

یـــان لە کۆتاییـــدا ، ئەوە پەیوەنـــدی بەخـــۆتەوە هەیە . ئەرکـــی دەرگـاوانیش تەنها چـاودێری کردنـی چوونە ژوورەوەی خەڵکانی بێگـــانەیە بـــۆ ئەپارتمـــانەکە نەك چـــاودێری هەڵســـوکەوتی دانیشتوانەکەی .

بە پەژارەیەکەوە ووتـی :

- بەڵکو چاودێری دانیشتوانەکە دەکات و هیچیتر .

- هاهاهـا .. هەرگیـز لەو بـڕوایەدا نەبـووم کە بەو شـێوەیە لە مـام عوسمان بترسیت .

بە هەڵچونیکەوە ووتـی :

- من لێی ناترسم .. بەڵکو نامەوێت بۆچونیکی خراپی لا دروستبێت بەرامبەرم .. ئەو لە سەعیدیەکانە کە ئافرەت عەبا دەپۆشیت لایان .

- بەڵام ئەو لە قاهیرە دەژی و دەبینێت کە ئافرەتی ئازاد دێتە دەرەوە و وەک پیاو دەڕواتەوە .

ووتـی :

- ئەو لەوە ناگـات . ڕۆژێـك خزمەتکـارە بەتەمەنەکە بـۆی گێـڕامەوە ووتـــی ڕۆژێـك باســی یەکێـک لە دانیشــتوانی ئەپارتمـانەکەی بۆ کـردووە کە خـراپە لەبەرئەوەی شـەوان درەنگ دێتەوە ..

ووتـی :

- ئایا نابێت کە ئەو کەسە کارەکەی یان بە هۆی گەشتێکەوە یا ئاهەنگێك هەرشتێک لەو بابەتە دڕەنگ بکەویت ؟

ووتـی :

- ئەو تەنها ئەوەندە تێدەگات کە ئەو کەسە ئـافرەتە ، دوور نـیە ئەو چەنـد کـاتژمێرەی شـەوی لەگەڵ پیاوێـک بەسـەر نەبردبێت ..

مـاوەیەکی درێـژ بێـدەنگی باڵیکێشـا بەسـەر هەردوکیانـدا ، چـاوە ڕەشەکانی هاتە پێشچاو کە لە ژێر سـەر و بەستەکەیەوە سـەرنجی

دەدات و پڕ گومانن .. هەمان ئەو تێڕوانینە بەو چاوانەوە بەردەوام سەرنجی دەدەن لە هەموو ڕۆیشتن و هاتن و چونە دەرەوەیەکی لە ئەپارتمـانەکە لە بەیانیـان و نیـوەڕوان و دوای نیـوەڕوان .. وەك ئەوەی لە خەیاڵیدا بێت چی بەسەر دێت پێی ووت : باشە ، گەر ئەم شەو چویتەوە و بە چاوێکی گومانەوە لێت ورد بوەوە پێی بڵـێ کە لەگەڵ دەزگیرانەکەتدا بویت و پاش چەند ڕۆژێك شووی پێدەکەیت .
دەنگە توڕەکەی لەو شەوەدا لەرینەوەیەکی دروستکردوو ووتی : تۆ وا هەست دەکەیت من لەبەردەم ئەو دەرگـاوانەدا دەوەستم لە دوای نیوەی شەوەوە و هۆکاری دڕەنگ کەوتنم و وردەکاری ژیانمی بۆ شیدەکەمەوە وەك ئەوەی بەرپرسم بێت ؟ ئایا ئەمە عەیبەیەك نیە بۆ من ؟
ووتی : من ئامادەم لەجیاتی تۆ ئەو کارە بکەم گەر پێت خۆشبێت ..
ووتی :

- ئەوە عەیبەیەکی زیاترە بۆمن . ئەو دەرگاوانە . مامۆستای ئایینی نیە .

بەسەرسوڕمانیکەوە ووتی :
- کەواتە چـارە چـیە ؟ پێشـت بـکەوم و چەنـد گـوللەیەکی پێـوەنێم پێشئەوەی تۆ بگەیتەوە ؟
پێکەنینێکی خۆش دایگرت و وەك ئەوەی هیچ چارەسەرێک نەبێت تەنهـا کوشـتنی مـام عوسـمان نـەبێت پێشـئەوەی ئەم بگـاتە دەرگـای ئەپارتمانەکە ، بەڵام مردنێکی قەزاوقەدەر نەك کوشتن.
پاشــان دەســتیکرد بەبیرکــردنەوە لەو نەخۆشــیانەی کە دەســتبەجێ مرۆڤ لەناو دەبەن . هیچ شتێکیشی لە تەندروستی و نەخۆشیەکان نەدەزانـی بەڵام لەخەڵـکەوە نەخۆشـی وەسـتانی دڵـی بیستبوو کە لە چەند چرکەیەکدا مرۆڤەکە دەمرێت . لەخۆی پرسی :
ئـاە . گەر ئێسـتا توشــی جەڵـتەی دڵ دەبـوو و هەردوو چـاوە تیـژە ئاگرینەکانی کە وەك لوولەی تفەنگە لێکی دەنا.

بەڵام دیمەنی هەرسی منداڵەکەی هاتە خەیالَ کە لە سەر کورسیە داریـــنەکە لە تەنیشـــتیەوە دانیشـــتوون و بە چـــاوە برســـی و بێگەردەکانیـانەوە ســەرنجی هــاتن و چــوونی ئەو خەڵــکە دەدەن لەناوەوە بۆ دەرەوە و بە پێچەوانەوە .

نەخێر .. ئەو ئەوەندە دڵ ڕەق نیە .. لە جەڵتەی دڵی کوشندە گەڕێ .. بــۆچی چاوەکــانی نەخــۆش نەکەون و بە لەفــافێکی ئەســتوور بپێچێت و توانای بینینی هیچ کەسێکی نەبێت ؟ .. بەڵام چۆن بەو خێراییە چاوەکانی نەخۆش بکەویت ؟ چەند کاتژمێریك لەمەوبەر بینیویەتی هاتۆتە دەرەوە لە ئەپارتمانەکە و چاوەکانی وەك چاوی هەڵۆ بەملاولادا دەسوڕان و سەرنجیاندەدا ..

کەواتە هـیچ چـارەیەکی تـر نـیە جـگە لە جەڵـتەی دڵ ... هەمـوو مانگێك بەشێک لە خواردنەکەی خۆی دەدات بە منداڵەکانی .

ئاە .. بۆچی ئەم بۆچونە خراپانە دێت بە مێشکیدا .. کاتیش دەڕوات و شـــەو تەواو دەبێـــت . ســـەیرێکی کـــاتژمێرەکەی کـــردوو بە پەشۆکاویەوە ووتی : کاتژمێر نزیك دەبێتەوە لە یەك ، چی بکەم ؟ دەمەویت بگەڕێمەوە ماڵەوە .

بە خەندەیەکەوە ووتی :

- لەگەڵت دێم دەتگەیەنم .

ووتی :

- نـا .. مـام عوسـمان دەتبینێـت . ئەو وا هەسـت دەکـات کە لەگەڵ پیاوێکـدا بـووم ، بەڵام ئەمە باشـترە کە بیـری بـۆ خراپتــر بــڕوات دوای ئەوەی بەچاوەکــانی خــۆی لەگەڵ پیاوێکدا بمبینێت..

پێکەنینێکـی خێـرا گرتـی و سـەیرێکی کردوو ووتـی : تـۆ هەسـت ناکەیت و بەشداری ئەو نەهامەتیەم ناکەیت کە تێیکەوتوم . تۆ بە دڵێکـی بـێ کێشـەوە پێدەکەنیت . بێگومـان تـۆ پیاویـت هەرکاتێـک بـگەڕێیتەوە مـاڵەوە ئاسـاییە و سـەربەرزیت و دەرگـاوانەکەش بە

ڕێزەوە لەبەرت هەڵدەسێت چونکە لەگەڵ ئافرەتان لە جرتو فرت بوویت ..

بە سەرسوڕمانیکەوە ووتی :

- من بڕوا ناکەم مام عوسمان پاڵەوانی ئەم کێشەیەت بێت ! وەك ئەوەی فێری ئەوە نەبوبیت ژیانی خۆت دیاری بکەیت و پیادەی ئاسایی ئەو ژیانە بکەیت بۆیە چەندین کۆت و بەندی خەیاڵی بۆ خۆت دروست دەکەیت کە هیچ پێویست نیە .

ووتی :

- تۆ ناتوانیت حوکم بدەیت چونکە هیچ کاتێک ئافرەت نەبویت ..

مام عوسمان هەر خۆی نیە بە تەنها بەڵکو بریتیە لە سەرجەم ئەو کۆمەڵگەیەی تیایدا دەژیم . کۆمەڵگە لە مێشکە بەتاڵ َ و سەرە پێچراوەکەی و چاوە تیژەکانی کە وەك چاوی مار وان حوکمم دەدەن . ئەوە کێشەی مام عوسمان نیە بە تەنها کە نیگەرانم دەکات ، بەڵکو کێشەی کۆمەڵگەیەکە بە تەواوی ..

هەستی بە شەپۆلەکانی یاخیبوون کرد لە لە هزری بچکۆلانەیدا ، چاوەکانی بریسکانەوە بە بریسکەی یاخێتی و بەرەنگاربونەوە و ووتی :

- بەڵام پێویستە من بە هیچ شتێکەوە ماندوو نەبم منیش ئازادم لە ژیانی تایبەتی خۆمدا وەك تۆ . وەك تۆ خوێندنم تەواو کردووە ، کاریش دەکەم وەك تۆ چۆن کاردەکەیت ، موچەیەکی بەرامبەر موچەکەی تۆش وەردەگرم . پێویستە ئازادیم پیادە بکەم وەك تۆ ..

ووتی :

- پێویستە وا بکەیت وەك ئافرەتێکی بەهێز خاوەنی کەسایەتی و ئازادی خۆی بێت .

ووتی :

- وا دەکەم . ئێستا دەڵێی چی دەمگەیەنیت تا نزیکی دەرگای ئەپارتمانەکە ؟

ووتی :

- گەر پێت خۆشبێت .

بەیەکەوە بە ڕێگە تاریکەکەدا ڕۆیشتن کە چۆڵبوو و فراوانتر و خاوێنتر بوو .. هەستی بە پەنجەکانی کرد دەئاڵێت لە دەستەکانیەوە ڕاستگۆیانە ، ئارامی هات بە دڵیدا و چووە ژێر باڵیەوە و بە هەنگاوێکی خەواڵویانەی هێمنەوە لەگەڵی دەرِۆیشت ، وەك ئەوەی لە خەونێکدا بێت و نەیەوێت بەئاگا بێتەوە ...

بەڵام هەر زۆر خێرا بە ئاگا هاتەوە هەر کە لە دوورەوە ئەو ئەپارتمانەی بەدیکرد کە تیایدا دەژی ، دڵی دەستی بەلیدان کرد و ئەو هێزەی کەمێک لەمەوبەر هەیبوو بووە هەڵم و سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد .. دووی بەرەبەیان بوو ، بە دەنگێکی دوور لە هەستکردنەوە ووتی :

- پێمباشە کە مام عوسمان نەتبینێت لەگەڵمدا لەم کاتە درەنگەدا ..

ووتی :

- بەڵام تۆ کەمێک لەمەو پێش سوربویت لەسەر پیادەکردنی ئازادیەکانت .

ووتی :

- بەڵێ . بەڵام لە ئێستادا ئەوە پێویست نیە ، دەتوانم لە بەیانیەوە پیادەی بکەم .

پێکەنینێکی شاراوەی کرد تا لەو بێدەنگی شەوەدا دەنگ نەداتەوە ، بە توندی دەستی گوشی و هیوای سەرکەوتنی بۆ خواست و خودا حافیزەی لێکرد تا بینینی سبەینی و ڕۆیشت .

پاشـــان بە تەنهـــا هەر خـــۆی بە ڕێکـــوپێکی و دوای ئەوەی ماسـولکەکانی جەسـتەیی و دەموچـاوی تونـد کـردەوە بە تەنیشـت کورسیە تەختەکەی مام عوسماندا بێئەوەی هیچ گوێیەکی پێ بدات چووە ناو ئەپارتمانەکەوە و بە تیلەی چاو سەیرێکی کرد بینی وەك تۆپەڵێـک درێـژ بـووە لەسـەر کورسـیەکە و چـاوە ئـاگرینە پـڕ گومانەکـانی لێکنـاوە بێـئەوەی بزانیـت ئایـا مـردووە یـان دەژی و نوستووە ، ئەو ئێستا ئەوەی بەلاوە گرنگ نیە و بە گاڵتەجاڕیەکەوە بەخۆیی ووت : چەند قێزەون بوو بیرکردنەوەم ! من لە تەنیشت ئەو پیاوەی خۆشمدەوێت لە نزیك نیل دانیشتبووم و بیر و هۆشم لای مام عوسمان بـوو . چەنـد گێـل بـووم ! چەنـدین لەو سـاتە جوانـانەم بە هەدەردا لەبیـــری ئەو تـــۆپەڵە وونەی لەهۆشـــخۆی چـــووە ، ئەو دەرگـاوانە کە فرمـانی پێـدەکەم و بەقسـەم دەکـات و پاشـان چەنـد فلسێکی وەك کرێ دەدەمێ ؟

پشـتی تێکـردوو بە خۆشـحاڵیەوە بەو هێـزەی هەیەتـی ڕۆیشـت و بەسـەر پلیکانەکانـدا سـەرکەوتە سـەرەوە .. لەپشتیشـیەوە گـوێی لە پرخـەیەکی ناخۆش بوو .. کەمێک وەستاو ئاوڕێکی دایەوە بینی مام عوسمان لە خەوێکی قوڵدایە لەسـەر کورسیە تەختەکە .. لێوەکـانی کرۆشـت لە بەزەیـی هـاتنەوەی بە مـام عوسـماندا و ووتـی : چەنـد گونـاهە مـام عوسـمان ! ئەو لە دەرەوە نوسـتووە دوای ئەو هەمـوو هیلاکیەی ڕۆژ و کەمێکی شەویش .

بە پلیکانەکانـدا بە چەنـد هەنگـاوێکی قورسـەوە سـەرکەوت و بە سەرسور ِمـانەوە لەخۆی دەپرسـی : چۆن لە چرکەیەکدا هەستی بەرامبەر مام عوسمان گۆڕا بۆ بەزەیی ؟ .. بەزەیی زیاتری بۆ ئەو هێـز و توانـایەی بـوو تـا کلـیلەکەی کـرد بە دەرگـاکەدا و چـووە ژوورەوە و جلوبەرگەکەی دانا و لەسەر سیسەمەکەی بە شادومانی و دڵێکی ئارامەوە نووست .

## خـەنـدە

لە خەو هەسـتام هەسـتمکرد پەژارەیەکـی زۆر سـەر و دڵمـی گرتووە ، وام لیدەکات هەست بکەم جەستەم زۆر قورسبێت .. هێندە قورسە وەك ئەوە وایە لە ئاسن دروستکرابێت .. پێویستی بە شتێک هەیە لەسـەر سیسـەمەکەوە بـۆ زەوی ڕایکێشـێت .. دەسـتمکرد بە گەڕان بە دوای هۆکـاری ئەو پەژارە گەورەیە ، هـیچم دەسـت نەکەوت .. تەنانەت دڵیشم و مێشکیشم لەو ساتەدا لەوێ نەبوون .
هەستمکرد قینم لە هەموو شتێکە لە ژیانمدا .. کارەکەم و هونەرەکەم و دایکـایەتیم و خۆشەویسـتیم و هاوڕێییەتیشـم .. هەمـوو شـتێک تەنـانەت خـودی خۆشـم .. لەسـەر جـێگەکەم دەسـتمکرد بەخـۆ هەڵگیـرانەوە و ئەمـدیوئەودیو کـردن ، هەسـتم بە بێـزاری کـرد لەدەست قوڵەکانم و قاچەکانم .. وەك ئەوەی ئەندامانێکی دەستکرد بن .. وا هات بە خەیاڵمدا کە بە تەواوی مێشکم جوڵاندنی ئەو بەشانەی بیر چۆتەوە .. ئیدی هەرگیز جووڵە ناکەن .

لەترسان دڵم ترپەیەکی بەهێزی کردوو هەرچی خوێنی مێشکمە هێنایە ناو سنگم و وەك بورکانێکی خەفەکراوی لێهات لە ناوەوە ... بە هەستان و بازێک لەسەر جێگەکەمەوە خۆم هەڵدایە سەر زەویەکە وەك ئەوەی تەزویەکی کارەبا بەر جەستەم کەوتبێت ..
بە ئەستونی لەسەر پێکانم وەستام و بەهێزیکی زۆرەوە هەردوکیانم دەجووڵاند تا دڵنیابم لەوەی کە بەباشی وەك جاران جووڵە دەکەن .
بە چەند هەنگاوێك چوومە نزیك کانتۆرەکە و لە جلوبەرگە کۆنەکانم دەستێك جلم پۆشی . بێ هیچ گوێ پێدانیك قژێکم داهێناو سەرنجێکی چاوەکانمدا .. دەستم نەچوو بەلای ئەو قەڵەمەکەی هەموو ڕۆژێك هێڵێکم دەکێشا بەسەر برژانگەکانم.. جانتاکەم دەستدایە بێئەوەی پیاڵە چاکەم بخۆمەوە وەك هەموو بەیانیانی تر و چوومە دەرەوە .. قاچەکانم بەرەو لای وێستگەی پاسەکان بردیانم وەك چۆن گوێدرێژ پێکانی بەرەو کێڵگە دەیبەن ..
پاسەکە هات وەك هەمیشە لێوان لێو بوو لە خەڵک ، توانیم سەربکەوم و بچمە ناوەوە .. چۆن ؟ نازانم .. بەڵام لە ناکاو خۆم بینیەوە لەنێو چەندین هەناسەی گەرمی قەرەباڵخی بێتام .. هەندێکی دوکەڵ بوو .. و هەندێکی دیکەی نەخۆشی .. هەندێکیش پیاز .. حەزم بۆ ژیان نەمابوو تاوەکو وەك جاران ڕابکەمە نزیك پەنجەرەکە و سەرمی لێوە دەربکەم .. ئەو پەژارە زۆرەی ئیرادەمی تواندبوەوە وای لێکردبووم لەو جێگەیە نەجولێم بێئەوەی هەست بە دەوروبەرم بکەم .. بێ گوێدانە ئەو هەموو قۆڵە لینجانەی دەوریانداوم ..
چاوە بێزارەکان کەوتە سەر شتێک ... ڕوخسارێک ... دەموچاوی مندالێک ؟ ڕوخساری کچێك ؟ دموچاوی پیاوێک ؟ نازانم .. چاوە بێهێزەکانم نەیانتوانی خاوەنی ڕوخسارەکان دیاری بکەن .. بەڵام من ڕوخسارێکم بینی .. لەسەر ئەو دەموچاوەش خەندەم بینی ..

ئەو خەندەیە بەخێرایی هێنامیەوە دونیا وەك چۆن قۆلاپێکی ماسی بەردێکی بە نرخ لە قولایی دەریاوە دەهێنێتە سەرزەوی .. وەك ئەوەی لە قولاییەکی تاریکدا بووبم و لە ڕێگەی گوریسێکەوە ڕایانکێشابمە بەر ڕۆشنایی و هەوا ..

وەك ئەوەی لێوەکانم خەندە کردنیان بیرچوبێتەوە ! ..

بە سەرسوڕمانیکەوە لەو ڕوخسارە وورد بومەوە چۆن وەڵامی ئەو خەندە سەیرە بدەمەوە .. کە وەك زمانێکی نوێ وابوو هێشتا فێری نەبووبووم .. بە جوڵاندنی سەرم وەڵامیم دایەوە کە هیچ واتایەکی نەدەبەخشی .. چاوەکانم لەسەر ڕوخساری جێگیرە و خۆم هەڵواسیوە بە لێوەکانیەوە وەك چۆن نوقوم بویەك خۆی بە گوریسی ڕزگاربوونەوە هەڵدەواسێت ..

هەستمکرد قورسی قاچەکانم کەمێک سووکبووە ، جەستە ئاسنینەکەشم شتێک نەرم بووە .. دەمم بێ ویستی خۆم کرایەوە و شتێکم ووت :

- سوپاست دەکەم ..

ووشەکە لە گوێچکەمدا لەرینەوەیەکی سەیری هەبوو .. ئەو لەرینەوەیە نەبوو کە گوێچکەکانم پێی ڕاهاتبوون .. هەمان ئەو مانایەشی نەبوو کە مێشکم لێی گەیشتبوو ..

گوێم لە هیچ وەڵامێکی نەبوو وەك ئەوەی لەو ووشە ئاساییانە نەگات کە خەڵکی بەکاریدەهێنن ، یاخود بڕوای پێی نیە .. بەڵام گوێم لە چاوەکانی بوو خەندەیان بۆ کردم .. چۆن گوێم لێبوو ، نازانم ؟ بەڵام هەستمکرد کە هەستە مردووەکانم سەرجەم خەڵکی بە ڕەشی دەیبینی ژیانی بۆ گەڕاوەتەوە و دەبینێت .. لە نزیکمەوە پەنجەرەیەکم بینی لێوەی سەیرمکرد .. بینیم تیشکی خۆر لەسەر ڕوکاری سەرەوەی نیل دەدات وەك چەند ڕایەڵەیەکی ئاڵتونینی جادویی سەیر .. خەڵکیم بینی لەشەقامەکاندا چالاکانە دێن و دەچن .. وەك ئەوەی ژیان لەوپەڕیدا بێت ..

پەنجەرەکەم جێهێشت و گەڕامەوە بۆ ڕوخسارەکە .. بینیم وەك خودا حافیزە کردنێک لێم بۆم دەچەمێتەوە و خەندە سەرسوڕهێنەرەکەش بەزیندویی لەسەر لێوەکانی ماوەتەوە .. بە جێگیری وەك بەشێک بێت لێی .. ڕوخسارەکە لە پاسەکە دابەزی و لە قەرەباڵخی شەقامەکەدا ونبوو .. بەڵام خەندەکە بەردەوام لەپێشچاومدا بوو وون نەدەبوو . بڕوایەکی وام لا دروستبوو ئەو خەندەیە هەرگیز لە خانەکانی بیرمدا ناڕەویتەوە و فەنا نابێت .. تەنانەت خودی مردنیش ناتوانێت بیسڕێتەوە.. گەر ئەم ڕوخسارە ڕۆژێك مردوو مەحاڵیشە هەر دەمرێت ، ئەوا ئەو خەندەیە هەرگیز نامرێت .. لەبیرمدا دەمێنێتەوە تا دەژیم .. گەر مردیشم ، کە هەر دەمرم ، ئەوا ئەو خەندەیە لەبیری ئەو کەسانەدا دەژی کە جگە لە من بینیویانە . گەر ئەوانیش مردن ، کە دەمرن مەحاڵە ، ئەوا لە بیری جگە لەوانیشدا کە بینیویانە دەژی .. وەك ئەوەی بریتی بێت لە خودایەکی نەمری بەهێز لێرەو لەوی ژیان دەبەخشێتەوە بەبێ ژماردە و پێوانە کردن ..

لە پەنجەرەکەوە هەوایەکی خۆشم بۆهات و بەقووڵی هەڵممژی و ئارامی و چالاکیەکیدا بە ماسولکەکانی دڵم .. بەخۆمم ووت : دونیا خۆشە .. خۆشە ..

وێستگەکە هات و لە پاسەکە دابەزیم .. بە هەنگاوێکی هێمنانە ڕۆیشتم ، هەستمکرد جەستەم لە پەڕ دروستبووە .. بە شەقامەکەدا دەڕۆیشتم وەك ئەوەی سەما بکەم .. گوێم لە دەنگێک بوو لەناخمدا گۆرانی دەچڕی .. بینیم هەموو ڕوخسارەکان خەندەم بۆ دەکەن و منیش بە خەندە کردنێکی ئاسایی و سروشتی وەڵامیان دەدەمەوە .. وەك ئەوەی .. وەك ئەوەی لێوەکانم هەرگیز خەندەیان لەبیر نەکردبێت ..

# نـرخی خوێن

کاتێک لەسەر زەوی ژوورەکە دانیشتبوو هەستی نەکردبوو کە هاوسەرەکەی کورِە شیرە خۆرەکەی جێهێشتووە لەسەر زەویەکە لە نزیك پریاسکەی نانەکەوە ، بەخۆ پەلکێشکردن چووە نزیکی و شانی گرتوو بە دەنگێکی ناسکی شکاوەوە جوڵاندی و ووتی :

- باوکی محمود ، باوکی محمود ، ئەوە نوستی ؟

وەك ئەوەی دەنگی لە دوورەوە ببیستێت و بیەوێت دەمبکاتەوە و پێی بڵێت :

- نەخێر من نە نوستووم بەڵام هەست و بینینم لەدەستداوە ..

بەڵام نەیتوانی دوو لێوە ووشـك هەڵهـاتووەکەی بکـاتەوە ، یـاخود لەوانەیە توانیبێتی بیکاتەوە بەڵام دەنگەکەی لێوە نەهاتۆتە دەرەوە ، و وون بـووە لەو ژێـرزەمینەدا تاریـك و تەنـگەی نێـوان دڵـی و لێوەکانی ..

لێوەکانی دووبارە پێکەوە لکانەوە بەڵام پێڵوەکانی کرانەوە و چاوە بـازنەییە گەشـەکانی دەرکەوتـن ، کە بازنەکانیـان لەنێو بـازنەیەکی تـری زەردبـاوی گەورەتـر وون بوبـوون کە چەنـدین مولـوولەی خوێنی لەخۆ گرتبوو ..

چاوەکـانی وەك گێـژ بونێکیـان لێهـاتبوو کە بە دەوری خۆیانـدا دەسـوڕانەوە و هاوسـەرەکەی بە خـواری و جـوڵاوی دەبینـی وەك میزڵدان دەهات و دەچوو لەپێش چاویدا .

- باوکی محمود ، باوکی محمود ، بۆ خاتری خودا هەستە . وا ڕۆژ ئاوا دەبێت و بانك دادەخرێت .

هەر کە گوێی لە ووشەی ( بانك دادەخرێت ) بوو ، بـاوکی محمود بە ئاگـا هـاتەوە و سـەرێکی قورسـی بەرزکـردەوە و چاوەکـانی دەسـوڕاند وەك ئەوەی لە ژوورێکـی تەنگـدا بە شـوێن شـتێکدا

بگەڕێت .. بینی لەسەر زەویەکە تەنها غازێکی یەکچاوی بچووك هەیە لە تەنیشت سنوقێکی تەختەوە لە ژوورەکەدا و ئەوە هەموو ناوماڵەکەیەتی .. لە تەنیشت خۆشیەوە کورِە شیرەخۆرەکەی بینی لەسەر زەویەکە ڕاکشاوە و قاچەکانی فرِێدەدا لای پریاسکەی نانەکەوە کە بەتاڵە و هیچی تیادا نیە ..

بە دەنگێکی کپی لاوازەوە ووتی : دایکی محمود .. محمود و سەنییە لە کوێن ؟ ..

- چوون بۆلای تەوحیدە خان ..

- هیچ سودێکی نیە ..

- بەڵکو ڕەحمی بجوڵێت و نانێکیان بداتێ گەدەیان بگرێت تا لە بانك دەگەرِێیتەوە .. دە هەستە خوا ئاگادارت بێت باوکی محمود ..

هەرچۆنێك بێت باوکی محمود دەستی بە دیوارەکە گرت کە شەڵاڵی ئاو تێزانی بارانا و بوبوو و هەستایە سەرپێ .. کۆکەیەکی توندی دورودرێژی کردوو و تفێکی گەورەی سووری کردە سەر زەوی ژوورەکە ..

هاوسەرەکەی شتێکی شۆرِی دا بە شانیدا وەك چاکەتێک و دڵنەوایی کردوو ووتی : خوات لەگەڵ بێت باوکی محمود .. خۆزگە بمتوانیایە لەجیاتیت بچومایە بەڵام من دوای چوار ڕۆژی دیکە سەرەم دێت..

باوکی محمود دەرگای ژوورەکەی کردەوە و هەوایەکی سارد لە ڕوخساری و لەو پارچەیەی سەر شانی و سەریشیدا و بە دەستگرتن بە دیوارەکانەوە بە قادرمەی ( دە ) نهۆمی تەواودا هاتە خوارەوە .. هەناسەکانی پچڕ پچڕ بوبوون و کۆکەی زیادی کردبوو تا بە تەواوی هاتە ناو شەقامەکەوە و بێئاگایانە پێکانی دەیانبرد ، وا هات بە خەیاڵیدا کە بە ویستی خۆی ناڕوات بەرێگەوە و شتێک لە پشتیەوە پاڵی پێوە دەنێت بۆ پێشەوە ..

لەناکاو هەستیکرد کە بۆکسێکی دەستێکی گەورە دای بە دەموپلیدا و دەنگێکی گەورە لە دوایەوە هات ووتی : کوێریت ؟ هەستی بە هیچ جۆرە ئازارێک نەکرد لە جەستەیدا لە ئەنجامی ئەو بۆکسەوە ، نەشیزانی ئەو دەنگە گەورەیە بۆ لەگەڵ ئەوێتی..
بەردەوام بوو لە هەنگاونان و ڕۆیشتن بە هەنگاوە پچڕ پچڕەکانی ، لە نزیکی چایخانەکەی حاجی بەدەویەوە ڕۆیشت و بۆنی قاوە و چاو دوکەڵ هات بەسەریدا ، خوازیاری ئەوە بوو کەمێک دانیشێت و چەند نەفەسێك لەو نێرگەلە گەشاوەیە بدات و چایەکی ڕەشی گەرمیش بخواتەوە .. بەڵام بیری کەوتەوە کە حاجی بەدەوی هەڕەشەی لێدانی لێکردووە تا مردن گەر بێت و نزیکی چایخانەکە بێتەوە تا ئەو سی قرشەی بە قەرزی چاو نیرگەلە کەوتۆتە لای نەدات ..
سەری کرد بە پاڵتۆکەیدا و ویستی بە چەند هەنگاوێك خێرا تێپەڕێت لەبەردەم چایخانەکەوە .. کۆکەیەکی زۆریشی دەهات بەڵام لە سنگیدا گرتی تا تێپەڕ ببێت لەبەردەم چایخانەکەوە چونکە حاجی بەدەوی کۆکەکەی لەنێو سەدان کەسدا دەناسێتەوە ..
هەر هێندەش کە لە چایخانەکە دوورکەوتەوە دڵی هێواش بوەوە و بە ئارەزوی خۆی کۆکەی کرد ، هەستی بە ئاسودەیی و ئازادی دەکرد کە بێ هیچ ترسێک بە ئارەزوی خۆی دەکۆکێت ، پاشان تفێکی گەورەی سووری کردە سەر زەویەکە ..
باوکی محمود نەیدەزانی کە چەند دوور ڕۆیشتووە و خۆی دابووە دەست پێکانی لەم شەقام بۆ ئەو شەقام و لەم شۆستە بۆ ئەو شۆستە ..
بۆ دواجار گەیشتە بانکەکە .. بینی ڕیزبەندیەکی دورودرێژە و وەك جاران و ڕوخسارەکان هەمان ئەو ڕوخسارانەن کە بەردەوام و دووبارە دەیانبینێت .. بۆن و بەرامیش هەمان بۆن و بەرامە .. هەمان دەنگە وەك هەموو جارێک :

- چۆنیت باوکی محمود ..
- خوا بتپارێزێت دەروێش ..
- ناوی خۆتت بیرە یان بیرت چۆتەوە ؟
- من تەمەنم بیرچێتەوە ئەوم بیرناچێتەوە !
- خۆتم لێ مەکە بە کورِی باش .. باشترینمان هەندێکجار ناوی خۆشی بیردەچێتەوە .. خۆ مێشک دەفتەر نیە ؟ ..
- ڕاستدەکەی خۆ مێشک دەفتەر نیە !
- باوکی محمود تۆ چەند ناوت هەیە ؟
- بەخوا تەنها سیان ..
- ئاسانە .. هاهاها

ئەم دوو پیاوە تێر بەیەکەوە پێکەنین وەك ئەوەی توانیبێتیان فیلَ لە شتێک بکەن .. دەتوانن کەسێک بخەڵەتێنن ، هەر یەکێکیان چەندین ناوی جیاجیای بۆ خۆی هەڵبژاردووە لە هەر بانکێك کە خوێن لە خەڵکی دەکرِێت ، تا بتوانێت لە بانکێك زیاتر خوێنی بفرۆشێت بێئەوەی کەس هەستی پێبکات ..

دەنگی پێکەنینەکەیان وەك وەرِینی سەگی نەخۆش وابوو دەنگی دەدایەوە ، بەڵام هەر زۆر زوو پێکەنینەکەیـــــــــان بە گەرووی وشکهەڵهاتویانەوە نووسا ، دووبارە چارە گرانی کەوتەوە سەر ڕوخساری هەردووکیان دوو ڕوخساری ڕەقی باریك ، هەریەکەیان بە شاردنەوەی کۆکەکەیان لە ڕیزەکەدا وەستان بەبێدەنگی ..

دەنگێک کە نووسابوو لە زۆری خوێندنەوەی ناوەکان .. دوای خوێندنەوەی هەر ناوێك پیاوێک لە ڕیزەکە دێتە دەرەوە و دەچێتە ژوورەوە و کاتێک لەدەرگایەکی ترەوە دێتە دەرەوە بە دەستەکەی تری قۆڵی گرتووە و هێندەیتر ڕوخساری پەشۆکاوە و چەند دڵۆپە عەرەقێکیش بە نێو چاوانیەوەیەتی .

ناوی ( سعید علی عەوەزێن ) خوێندرایەوە .. دەنگە دەنگێک لە ڕیزەکەدا دروستبوو ، پاشان باوکی محمود هەستی بە نوقرچێك کرد لە پشتیەوە کە هاوڕێکەی بوو بە گوێیدا چرپاندی و ووتی :
- باوکی محمود ئەوە نوستویت یا ناوی خۆتت بیرچۆتەوە ؟
باوکی محمود وەك ئەوەی لەهۆش خۆی چووبێت ڕاپەڕی و بەئاگا هاتبێتەوە و سەریکرد بە پاڵتۆکەیدا و خۆیکرد بە ڕارِەوە تەنگەکەدا کە درێژی و پانی وەك درێژی قۆڵی وایە و دواتر لایکردەوە و خۆیکرد بە ژوورێکی بچووکدا و لەسەر قەرەوێڵەیەك ڕاکشاو هەمان هەناسە هەڵکێشانی ئەو کەسەی بیست وەك هەموو جارێک و دەرزییە ئەستوورە درێژەکەی هەڵچەقاند لە پێستە وشکهەڵهاتووەکەی کە وەك دەرزی پینەچی چۆن دەچێت بە قەراغی نەعلدا وابوو ..
ئەمجارەیان هەستی بە ئازار نەکرد وەك جاران هەستی پێدەکرد کاتێک دەرزییەکەی دەبردە ناوەوە ، چاوەکانیشی نەکردەوە تا سەرنجی خوێنە ڕەشەکەی بدات کە چۆن دەچێتە ناو بتڵە شوشەکەوە و بەرزدەبێتەوە تا دەگاتە ( 500 ) سەنتیمەتر .. هەموو جارێک چاوی دەربڕییە شوشوکە تاکو لەوەی کە برِیارە زیاتر نەچێتە ژوورەوە وەك چۆن چاوی بەقالَ لەسەر ڕۆنەکەیە و بە ئاگایە لە تەرازووەکەی تا دڵۆپێکی زیاتر نەچێتە خوارەوە ..
بەڵام باوکی محمود ئەمجارە ( وون ) ە ، هەستی کرد توانای سەرنجدانی هیچ شتێکی نیە . هەموو ئەوەی دەیویست ئەوەبوو کە لێیگەرِێن لەسەر ئەو قەرەوێڵەیە ڕاکشێت .. بەڵام هەر زوو دەستێکیاندا بە شانیدا و ووتیان هەستە بچۆرە دەرەوە .. بە لەشێکی قورسەوە هەستا و پاڵتۆکەی لە سەریەوە پێچاو و قاچەکانی بۆ ژورێکی تر بردیان لای ڕاستەوە و لە ڕیزێکی تردا وەستا لەنزیك مێزیك ، دەستی درێژ کردوو دوو وەرەقەی وەرگرت .. یەکێکیان

گەورە و نەرم بـــڕی یەك جونەیـــە بـــوو ، دووەمیـــان قەبـــارەی بچوکتربوو و نەرمیشی کەمتربوو بڕی نیو جونەیە بوو ..
بە بەختـەوەریەکەوە پەنـجە باریکەکـانی هێنـا بە کاغەزەکانـدا . بە خۆی ووت : نـان و گۆشـت و دوکەڵ و چـاو هەمـوو شتێکی پـێ دەکرم ..
بە هەنگـاوە لەرزۆکەکـانی بەرەو دەرگـاکە چـوو .. بینـی ڕیـزەکەی دەرەوە بۆتە چوار ڕیز ، هەستیکرد چاوەکانی دەروێشی هاوڕێی بۆتە هەشت چاو و زۆر بە ترسـەوە لێـی وورد دەبێتـەوە .. بـاوکی محمود نەیدەزانی ئەو ڕوخسـارە گەورەیە کێیە کە لەبەردەمیدایە و بە سەرسوڕمانەوە لێی وورد دەبێتەوە و بە ئاستەم توانی بزانێت کە ڕوخساری دەروێشی هاوڕێیەتی..
بـــاوکی محمـــود نەیزانـــی چـــی ڕودەدات لە دەوروبەری و هـــیچ دەنگێکـــی نەدەبیســـت بەڵام لێـــوە وشـــکهەڵاتوەکانی کـــرانەوە و خەنـدەیەکی کورتیـان کـردوو بە هەوڵێکـی زۆر دەنگـی هەڵبـڕی و دەستی بە پارەکەوە هێنایە دەرەوە و ووتـی :

- دەروێـش ، دەروێـش ، بگـرە ئەو جونەیەونیـوێکە بیـدەرە دەست ژنەکەم و محمود و سەنییە ، بیبەیت دەروێش بیرت نەچێـت .. ئاگـاداربە .. دەروێـش بیـرت نەچێـت .. تـا نـان و گۆشتی پێ بکرن .. دەروێش ..

پاشان جەستە لاوازەکەی کەوتە سەر زەوی و چاوەکانی لێکنا و مرد ..

# خـۆشەویستی تـاقـانـەم

هەموو ئافرەتێکی خیانەتکار پیاوێکی خیانەتکاری لەپشتەوەیە ڕەنگـی ئاسـمان لە چاومـدا سـەیربوو . هەروەهـا چێـژی نـان و پەنیـریش لە دەممـدا زۆر جیـاوازتر بـوو لەو تـام و چێـژەی پێشـتر ناسـیبووم .. ڕوخسـاری ئەو خەڵـکەش کە لەبەردەمـمەوە دەهـاتن و

دەچوون لە ڕوخساری بوکەڵە سەماکەرەکانی دەکرد .. تەنانەت ئەو هەوایەی کە هەستم پێدەکرد بە ئاستەم دەچووە سنگمەوە ، سەیربوو لە بۆن و لە چڕیشیدا ..

لە دەستەکانم وورد بومەوە کاتێک پارچە نانێکم پێگرتبوو هەستمکرد بە هەمان شێوە ئەویش جیاواز و سەیرە بەلامەوە ، لە جووڵە و شێوەیدا ، پەنجەکانیشم بە نانەکەوە لە پەنجەی بوکەڵەی دەکرد و وەك ئەوە وابوو نە خوێنی تێدابێت و نە ژیان ..

هەموو شتێک لە دەوروبەرم وەك ئەوە وایە کۆتایی پێبێت ، یان کەمێکە کۆتایی هاتووە .. هەستم بە فەنا بوون کرد لە گەرومدا و پارچە نانەکە لە دەستم کەوتە خوارەوە . سەگێکی ڕەشم بینی بە ڕاکردن بۆی دێت .. بە ددانەکانی گرتی و سەیری کردم .. نەمزانی چی لە چاوەکانیدا بوو .. فرمێسك ! برسێتی ! ئازار ؟ ڕیسوایی ؟ تەنیایی .. یان هەموو ئەمانە پێکەوە ؟

لە سەرسوڕِمانمدا دەمم کردەوە وەك ئەوەی لەو جیهانەدا کە کەمێک پێش ئێستا بینیم کۆتایی دەهات پارچەیەك ژیانم دۆزییەوە ، چۆن پارچەیەك و چۆن ژیانێك ، دوو چاوی سەگێکم دۆزیەوە کۆششیان تیادا تاقیدەکەمەوە ، هەروەها برسێتیان تیادایە ، زۆر شتی تریش کە ئاماژەن بۆ نەبوونی و ئازار ، بۆ شتێک لێکدانەوە دەدات ، دەڵێت ، دەنگ دەدات لەو جیهانە کەرِە مردوەدا ..

لە سەگەکە نزیك بوومەوە و دەستیکم هێنا بەسەر سەری و پشتیدا .. سەگەکە هەستی بە ئارامی و سۆزکرد و سەری سوڕما وەك ئەوەی هیچ کەسێک لەمەوبەر دەستی نەهێنابێت بەسەر و پشتیدا ، پاشان لە بەردەممدا چەمیەوە ، وەك منداڵێکی هەتیوی وون هاتە ژێر دەستمەوە ..

* * *

هەستم بە فرمێسکی گەرمکرد بە ڕومەتەکانمدا دێتە خوارەوە ، بە بەزەییەکەوە سەیری کردم ، پارچە نانەکە لە ددانەکانی کەوتە

خـوارەوە ، سـەرقاڵی بـۆن پێـوە کردنـی بـوو و دەسـورِایەوە وەك ئەوەی پێم بڵێت : مەگری .. منت لەگەڵدام !!
سەرمسورِماو بە خۆمم ووت : ئەو ووشانە پیاوێک پێی نەوتووم کە ناوی مێردمە .
خەندەیەکی سوپاسگوزاریم بۆ سەگەکە کرد و دەستمهێنا بە پشتیدا ، جێمهێشت ، ڕۆیشتم و بیرم دەکردەوە .. ئایا بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە ، نەخێـر ، مەحـاڵە ، پێمخۆشـە لێـرە لەم کەنـار ڕێـگەیە بمـرم و نەگەرِێمەوە ماڵەوە ..
چاوەکـانم چـووە خەو مێـردەکەمم بینـی لە ژووری نـانخواردنەکە دانیشـتووە بە دەسـتە بیجـامە نـوێکەیەوە کە بـۆم کرِیبـوو لەجیـاتی ئەوەی جووتێك پێڵاو بۆ خۆم بکرِم کە پێڵاوەکانم کۆن و بێکەڵـک بوبوون .. دەستێك بیجامەی نوێی حەریری سپیم بۆ ئەو کرِیبـوو ..
گوێم لێی بوو پێی ووتم : کێ ئەوەی پێ وتووی ؟
وتم : فڵان و فڵان و فڵانە کەس ..
کەمێک بێدەنگ بوو ..
وامزانــی پێمــدەڵێت : ئەوانە درۆ دەکەن ، قســە کۆتــایی پێــدێت و دەچێـتە دەرەوە بـۆ کـارەکەی .. بەڵام گـوێم لێیبـوو دەیـوت : ئەوان بڕوایـان بە خۆشەویسـتی مـن کـردووە بـۆی ، مـن هەمـوو ڕۆژێـك دەیبینم ، دەچمە ماڵەوە بۆلای ، چیت دەویت ؟
دەمم کردەوە تا وەڵام بدەمەوە بەڵام ووشەکان لەسەر لێوم وشکبوون هەستمکرد دڵم لێنادات ، ژیان لە ناخمدا بەستویەتی ، کۆتـایم پێهـات .. لەناکـاو بەئاگـا هـاتمەوە و بینـیم چـاوانێکی زۆر لە دەورمـن و پێم دەڵێن : دایە ..
لە ئامێزم نەگرت و ماچیشم نەکرد ، بینیم چاوانێکن من نایاناسـم .. لە چــاوی ئەو پیــاوە دەچــن کە کەمێــک لەمەوبەر لەبەردەممــدا دانیشـتبوو ، هەسـتمکرد نـاخی مـردووم شـوێنێکی بـۆ دایکـایەتی تێدا

نەمـــاوەتەوە .. ئەی دایکـــایەتیم چـــیە ؟ ئایـــا بریتـــی نـــیە لە درێژکراوەیەکـــی خۆشەویســـتیم ؟ ئایـــا خۆشەویســـتیم بەرهەمـــی خۆشەویستی نیە ؟..

بێئاگایانە دەرِۆیشتم .. بۆ کوێ بچم ، بۆلای باوکم ، بۆلای دایکم ، ئەی چیـان پـێ بڵـێم ؟ مێـردەکەم خیـانەتم لێـدەکات ، ئـای بـۆ ئەو عەیبەیەی دێتە سەرم پێش ئەو ، ئای بۆ ئەو کەرامەتەی لە دەست دەچێت کە هی منە ... نەخێر ، ناچم بۆلایان .. هیچ کەسێک نە لە مـرۆڤ و جـگە مـرۆڤ نازانێـت کە مێـردەکەم خیـانەتم لێـدەکات .. هەنـدێک خەڵـک لەگەڵ ئـافرەتێکی تـر دەیبیـنن و سـکاڵا دەکەن .. بەڵام گومـان وەك ڕاسـتی نـیە ، هەمـوو خەڵکـی سـکاڵا لە هەمـوو خەڵکی دەکەن ... ئەمە شتێکی ئاساییە وەك خەیالَ ... و هەوا ... و ئاو ... بەڵام ڕاستی ! نەخێر هەرگیز ئەو نهێنیە ترسناکەیان بۆ نـادرکێنم ... ڕۆیشـتم ... و ڕۆیشـتم ... هەسـتمکرد ئازارێـک لە قاچەکانمـدایە .. ئـاە ! بریـا لەجیـاتی دەسـتە بیجـامەکە پێڵاوەکـانم بکڕیایە .. بۆ کوێ بچم ، بۆ کوێ بچم ؟

نەمزانی چۆن وێنەکەی هـاتەوە بە مێشـکمدا ، پیـاوێکی مامناوەنـدی دوو چاوی شینی تەنگ .. کە بۆ یەکەمینجار لەگەڵ مێردەکەم بینـیم بـێ هـیچ هـۆیەك قیـنم لێبیـوو ، لەوانـەیە هۆکـارەکە ئەو هەمـوو جووڵەیە بوبێت کە بە ملی دەیکرد بۆ توند کردنەوەی بۆینبـاغەکەی ، یاخود دەنگە تیژە نالەبارەکەی بوبێت کاتێـک قسـەی دەکـرد و لە دەنگی ئافرەتی دەکرد ، بەڵام مێردەکەم خۆشـی دەویسـت و گرنگـی پـێ دەدا هەربـۆیە واباشـتربوو کە ئەو قینـەم بشـارمەوە ، ئەم پیـاوەم زۆر دەبینـی لەگەڵ مێـردەکەم ... جارێکیـان هـات مێـردەکەم لەمـاڵ نەبـوو .. وامزانـی دەڕوات بەڵام دانیشـت و داوای فنجانیـك قـاوەی کرد .. پاشان دەستیکرد بە قسەکردن و سەرنجدانم.. بۆ قوڵم ، سنگم ، قاچەکـانم کاتێـک دەهـاتم و دەچـووم .. هەسـتمکرد تێروانینەکـانی خەریکە جلوبەرگەکەم لەبەردادەنـی ، زۆر بـی شـەرم و هیچـوپەچ

بوو گویم لێی بوو به دەنگێکی قێزەون که ناوسکمی پێ ئازار دەهات خەریك بوو دەیرشاندمەوه پێی وتم : مێردەکەت شانسیکی زۆری هەیه . من بەخیلی بەم پیاوه دەبەم .
نەمزانی چۆن ئەو پیاوەم بەبیردا هاتەوه ، لەگەڵ ئەوەی ئەو ڕووداوه دوو ساڵ لەمەوبەر ڕوویدا و دوباره نەبوەوه ، تەنانەت بیرم چووبوەوه .. ئایا لەبەر ئەوەبوو که تاکه پیاوێک بوو پیامدا هەڵبدات لەدوای شووکردنمەوه، ئایا من وام لێهاتووه پێویستم بەو وشانەیه که پێی وتم : ( مێردەکەت شانسی هەیه ، من بەخیلی بەم پیاوه دەبەم ) ، هەستمکرد بڕوابوونم به مێینەییم دەستی به هەژان کردووه ... چاوەکانم لێکنا ، ئاه .. نامەویت ئەو هەستەم لادروست بێت ، نامەویت مێیینەیم ببینم لەبەردەممدا گیان بدات ، نا ناهێڵم گیانبدات ، له مردن ڕزگاری دەکەم !
له ڕێگه چاوەکانم کردەوه و ڕۆیشتم ڕامکرد بۆلای ، ماڵەکەشیم دەزانی ، چونکه مێردەکەم زۆر دەچوو بۆلای ، بینیم روخساری گرژ بوو کاتێک دەرگاکەی کردەوه و بینیمی .. سەرەتا وایزانی مێردەکەم تووشی ڕووداویك بووه ، بەڵام من دانیشتم عەرەقەکەم وشك کردەوه و ، ماوەیەك به بێدەنگی مامەوه و قینم دووباره بوەوه بۆی بەتایبەت کاتێک به جلی ماڵەوه بینیم دوو قوڵی باریك و دوو قاچی خواری باریکی توکن وەك ئەوه وابوو چەند مانگیك بێت خۆی نەشۆرییت ..
بی ئەوەی سەیری بکەم وتم : ئەمەویت بزانم ، بۆچی ڕۆژیك لەڕۆژان پێت وتم که مێردەکەم شانسی هەیه و بەخیلی پێ دەبەیت ؟ بۆچی وات وت ؟ تەنها بۆ دواندنی من بوو ؟ یان مەبەستێکت هەبوو ؟
گوێم لی بوو وتی : مەبەستم بوو ئێستاشی لەگەڵدابێت .
هەستم به تەزووی هیواکرد له ناخمدا ، ژیانم پێ دەبەخشێت ، هەندێک ژیان دەبەخشێت به مێیینەییم که له گیانداندایه ..

وتم : بەڵام ئەو منی جێهێشت بۆ ئافرەتێکی تر .
وتی : ئەو گێلە ! هەموو پیاوان گێلن کەمێکیان نەبێت .
وتم : ئەی تۆ ؟
وتی : من لە کەمینەکەم . هەربۆیەش ژنم نەهێناوە .
لەسەر کورسیەکەی خۆی ڕێک کردەوە و وتی : چەند ساڵە هاوسەریتان پێکهێناوە ؟
وتم : 10 ساڵە .
بە پێکەنینیکەوە وتی : ئەی ئایا ئەمە یەکەمین خیانەتیتی ؟
هەستمکرد حەزێکی زۆرم هەیە کە زللەیەکی لی بدەم ، بەڵام گوێم لێی بوو پێکەنی زیاتر و وتی : مەبەستم ئەوەیە ئەمە یەکەمین خیانەتیتی تۆ پێی بزانیت ؟
بە رقیکەوە وتم : مەبەستت ئەوەیە کە بەردەوام وابووە .
وتی : نازانم . بەڵام دەزانم کە هەموو ئەو پیاوانەی من دەیانناسم خیانەت لە ژنەکانیان دەکەن .
بە قینیکی زۆرەوە وتم : هەموو پیاوان کین : پیاو هەر بە سروشتی خیانەتکارە .
لایکردەوە بەولاداو وتی : کەوابێت بە سروشتی وابێت ، ناتوانین ناوی بنیین خیانەت .
- ئەی کەواتە ناوی بنیین چی ؟
- بۆچی ناوی بنیین ؟ من قینم لە ناوە . هیچ ناویك بەرجەستەی ئەو شتە ناکات کە مەبەستتە ، مرۆڤ بۆی نیە ناو لە شتێک بنیت کە لە دروستکراوی خۆی نەبێت ، سروشت زۆر لە مرۆڤ گەورەترە .
کەمێک بیدەنگ بوو بیرم کردەوە .. وتم : لەو پیاوە سەیرە ! توانای ئەوەی هەیە بیانوو بۆ هەر شتێک بینیتەوە بە زمانی .. بەڵام من هەستم بە شتێک لە ژیان کرد دێتەوە بەبەر مێشکی وەستاوم ، بی ئاگایانە سەرم نوساند بە پشتی کورسیەکەوە و وتم : ئەی ئافرەت ؟
بی بیرکردنەوە وتی : تەواو وەك پیاوە .

ڕاپەڕیم و هەستامە سەرپێ و وتم : نەخێر ! هەرگیز ئافرەت بیر لە خیانەتکردن ناکاتەوە لە مێردەکەی ! ..
بە بڕوابونیکی زۆرەوە گوێم لە دەنگدانەوەی ئەم قسەیەم بوو ..
بینیم بە تێڕوانینیکی بە واتایانە سەرنجم دەدات وتم : تەنها کاتێک نەبێت کە زانی خیانەتی لی دەکات . ئەوکات منیش ناوی نانیم خیانەتکار ، لەبەرئەوەی خیانەت لەخودی خۆی دەکات پێش ئەوەی خیانەت لەو بکات ، و کەرامەتی بەفیرِۆ دەدات پێش کەرامەتی ئەو ، ئەوە جۆرێکە لە خۆکوژیەکی سست کە ئافرەتی ترسنۆك دەیگریتەبەر لەو کاتەی لە مردنی خێراو کتوپرِی دەترسیت .
کەمێک بیدەنگ بوو پاشان خەندەیەکی کردوو وتی : ئافرەتێکی سەیرە ! توانای پاساو هێنانەوەی هەیە بە زمانی بۆ هەرشتێک کە بیەوێت .
خەندەیەکم کردوو ئەویش ئەو هەلەی قۆستەوە و وتی : چی دەخۆیتەوە؟
وتم : قاوەیەکی سادە .
هەستاو چووە چیشتخانەو جیی هیشتم ... دەستمکرد بە سەرنجدان و وردبوونەوە لەو هۆلَەی تێیدا دانیشتبووم بینیم ناومالَەکە هەر پارچەی لەلایەکە و بلاوە بی هیچ ڕێکخستنیك و ن پیس و پۆخلَیەکی زۆری پێوە دیارە .. دووبارە هێندەی تر قینم لێی هەستا لەخۆیی و لە ژیانیشی ... ئەی بۆ ئەو درۆزنی دەستبرِە ئایا بڕوای بەهەموو ئەو قسانە هەیە کە دەیانکات .. ئایا ڕاستە وەك دەڵێت لە ژیان تێگەیشتووە لەوانەیە فقەیلەسوفیکی گەورە بێت ، ئەی گەر ئەو بەو شێوەیە سەرکەوتووە بەسەر خەڵکی و ژیاندا بۆچی ژیانی خۆی لەهی هەمووان خراپترە ، ماڵەکەشی پیسترینە ، و جەستەی لە جەستەی ئەوان پیسترە . تێگەیشتنی ڕاستەقینە پاڵنەرە بەرەو پێشەوە ، بۆ سەرکەوتن ، و ژیانیش بەردەوام و هەمیشە کاراترین هەڵدەبژیریت ..

گەڕایەوە و فنجانیك قاوەی بەدەستەوە بوو .
پێم ووت : ئەی تۆ قاوە ناخۆیتەوە ؟
وتی : بیخۆرەوە ، من تەنها یەك فنجانم هەیە ناتوانین هەردووكمان لە یەك كاتدا بەكاریبهێنین .
پێکەنیم کاتێک لە مووە لچكاوەكانی قاچی وورد دەبوومەوە و لێم پرسی تۆ لەم ژیانەی هەڵتبژاردووە بەختەوەریت ؟
بە سانابییەکەوە پێی وتم : ئەی تۆ بەختەوەریت ؟ .. ئایا مێردەکەت بەختەوەرە ؟ .. ئایا خەڵکی بەختەوەرن ؟ .. من لە ژیاندا بەدوای بەختەوەریدا ناگەڕێم ، بەڵکو تیایدا لە نەهامەتی هەڵدیم .. قاوەکەت بخۆرەوە پێش ئەوەی ساردبێتەوە .
بەبێ دەنگی و لەسەرخۆ دەستمكرد بە خواردنەوەی قاوەکەم ، هەستم بە تێروانینەكانی كرد بۆ دەموچاوم و دەستەكانم ، بۆچی سەیرم دەكات ؟ سەیرە ! من وا هەستم دەکرد پیاوێکی سادەی هیچە . ئای بۆ نەزانیم ! زۆرجار دیمەن و شێوەكان فریومان دەدەن . بەڵام ئایا ئەو بێكەڵک و هیچ نیە ؟ . نازانم .. بێکەڵکی و هیچ چییە ؟ بۆ بەردەوامە لە سەیر کردنم ؟ ئایا هێشتا بڕوای بەوە هەیە کە بەغیلی بە مێردەکەم دەبات و دەڵێت شانسی زۆرە ؟ .. ئایا وەك ئافرەتێک حەزی هەیە بۆم ، ئایا دەیەوێت هاوكاریم بكات یان دەستم دەبڕیت ؟ هیچ شتێک نازانم .
وەك ئەوەی بیرم بخوێنێتەوە یان گوێم لێیبوو ووتی : ئێستاش دەلێم مێردەکەت شانسی هەیە و من بەغیلی پێدەبەم ، بەڵام من تەنها تاڵێکی سەرت دەست لێنادەم .. بە سەرسوڕمانێکەوە سەرنجیمدا و ووتم : بۆچی ؟
لەناکاو وخساری گرژبوو . هەستم بە توڕەبوون و ڕاپەڕین کرد تیایدا و هەستایە سەرپێ و بە زمانێکی توڕەوە ووتی : من نابمە ئەو چەقۆیەی لە سنگی خۆتی بدەیت ، تۆ دەتەوێت خیانەت لەخۆت و

مێردەکەشت بکەیت . بەڵام لە ڕاستیدا تۆ خیانەت لە کەسێکیتر دەکەیت پێش خۆت و مێردەکەشت ، ئەو کەسەش منم !

دڵم لە ئاست ئەو ووشە قووڵە ڕاسەقینانەدا قۆڵپیدا ،هەرگیز نەمبینیبوو بەو شێوە توند و ڕاستگۆییە بدوێت ، هەستم بە فرمێسکێکی گەرم کرد بەسەر ڕومەتەکانمدا دێتە خوارەوە ، سەرم داخست ، ماوەیەکی زۆر بێدەنگی دایگرتین ، جانتاکەم دەستدایە ، هەستام و پێم ووت : سوپاس بۆ قاوەکە .

چاوی بەرزکردەوە بێئەوەی هەستێتە سەرپێ و پێی ووتم : ئەی بۆ کویێ دەچیت ؟

ووتم : بۆ ماڵەوە .

ووتی : مێردەکەت خیانەتکارە ؟

ووتم : لێی دەبورم .

ووتی : بۆچی ؟

ووتم : بەدوای بەختەوەریدا ناگەڕێم لە ژیاندا ، بەڵکو لە نەهامەتی هەڵدێم .

قاقایەکی کردوو ووتی : ئای بۆ ژیری ! ئای بۆ دانایی !

پێکەنیم و چوومە دەرەوە .. چوومەوە ماڵەوە بینیم مێردەکەم دانیشتووە و منداڵەکانی لەدەورە .. بەرە و پیرم هاتن و لەخۆشیان دەستیانکرد بە : دایە .. دایە .

کاتێک هەرا و هوریا کۆتاییهات و من مێردەکەم بە تەنیا ماینەوە بە خەندەیەکەوە پێی ووتم : چویت تا تۆڵەم لێبکەیتەوە. خیانەتت لێکردم؟

سەرسوڕمانیك لە ڕوخسارمدا دەرکەوت و ووتم : چۆنت زانی ؟

بە متمانەیەك و بە سادەییەکەوە وەڵامیدامەوە و ووتی : من لە ئافرەت دەگەم .

خەندەیەکم کردوو ووتم : ئای لە پیاوی لەخۆبایی !..

هەستم بە قۆڵە بەهێزەکانی کرد تیوەم دەئاڵێن و بە گوێچکەمدا چرپاندی و ووتی : خۆشمدەوێیت . کەمێک لێی دوورکەوتمەوە و بە سەرسوڕمانیکەوە لێی وورد بوومەوە و پێموت :

- ئەی ئەوەی ئەم بەیانیە خۆشتدەویست ؟

ڕایکێشام بۆلای خۆیی و زیاتر و زیاتر نوساندمی بە سنگیەوە و بە چرپە ووتی :

- ئەوە لە بەیانیدا بوو و بەیانیش کۆتایی هاتووە .

لە دەستی هەڵهاتم و دوور کەوتمەوە و بە توڕەییەکەوە ووتم: چەند دەستبڕی ! لە یەك كاتدا فیلَ لە هەردوکمان دەکەیت !

بە لەخۆباییەکەوە خەندەیەکی کردوو ووتی : بەڵکو لە یەک کاتدا بۆ هەردوکتان دڵسۆزم .

بە توڕەییەکەوە ووتم : نەخێر ، من لەگەڵ تۆدا ناژیم .

کەمێک داڵغە بردمیەوە و ووتم : دەڕۆم بۆلای .

خۆی ڕێک کردەوە و ووتی : کێیە ؟

ووتم : هاوڕێ خۆشەویستەکەت .

لە پێکەنیندا خەریکبوو بتەقێت بە پشتا کەوت و بە لەخۆباییەکەوە ووتی : ناتوانیت .

بە سەرسوڕمانیکەوە سەیرم کردوو ووتم : بۆچی ؟

بە سادەیی ووتی : ئەو نەخۆشە ، هەربۆیەش ژنی نەهێناوە .

زەوی لەبەردەممدا سوڕِایەوە .. بەخۆمم ووت : ئای لەو پیاوە بێکەڵکە !

سەیرێکی مێردەکەم کرد لەسەر پشت ڕاکشابوو و چاوەکانی لەبرسان و ویستن سەرنجیان دەدام ، بەخۆمم ووت : ئای بۆ پیاوە بێ کەڵکەکان ! هەموو پیاوان !

گوێم لە دەنگی منداڵان بوو بانگیان دەکردم : دایە .. دایە ، لە ژوورەکە چوومە دەرەوە و ڕامکرد بۆلایان ئەوان وەك دارێکی خۆ ڕزگارکردن وابوون لە دەریایەکدا خۆمم پێدا هەڵواسی ، لە چاوە

بێ گوناهەکانیان وورد بوومەوە کە لێیان دەڕوانیم چاوەکانی سەگە ڕەشەکەم هاتەوە یاد کە ئەم بەیانیە بینیم ، برسێتی و ئازار و نەبوونی لەخۆگرتبوو .
بە ڕاکردن بەرە و چێشتخانە ڕۆیشتم و خواردنم بۆ ئامادەکردن و دانیشتم لێیان وورد دەبوومەوە کاتێک سەرقاڵی خواردن بوون ، هەستمکرد لەناکاو دایکایەتیم بە ئاگا هاتەوە ، هەستم بە چێژ و بەختەوەرییەك کرد کە پێشتر هەستم پێنەکردبوو .
جەستەی ماندووم خستە سەر جێگەکە و هەستم بە حەوانەوەیەکی تەواوکرد .
بەخۆمم ووت : نەخێر . دایکایەتیم درێژکراوەی خۆشەویستسم نیە و خۆشەویستیەکەی بەرهەمی خۆشەویستیم نیە .. بەڵکو .. ئەوە خۆشەویستی تاقانەی ڕاستەقینەمە .

## ڕوکارەکەی تر ..

دونیا شەوە ، شەوی هاوینی گەرمی بێ خەوش ، شنە بای ناسکی قاهیرەش لە پەنجەرەی ئوتومبیلە درێژەکەوە دێتە ناوەوە چەندین تاڵی قژە ڕەشە خاوەکەی هەڵدەگرێت و بە هێمنی دەیدات بە

ڕوخساریدا ، بە چاوەکانیدا ، و ئاستی بینینی ڕێگەکەی لێدەگرێت کە بە خێرایی بەژێر تایەی ئوتومبیلەکەدا دەڕوات ، تاو نا تاوێك پەنجە بە پەنجە درێژەکانی تاڵەکان لا دەدات و دەیانخاتەوە جێگەی خۆی ..
حیکمەت سەیرێکی تەنیشت خۆیی کرد بینی لە تەنیشتیەوە دانیشتوە و سوکانەکەی بە دەستەوەیە و بۆ پێشەوە دەڕوانێت ، لەلاوە لووتی وەك ئەوەی بازنەیی بێت وا دەردەکەوێت و چاوەکانیشی تا رادەیەك لێڵ . هەستی بە گرژیەکی سەیر کرد. ئەو پێشتر جارێک یان دووان بینیویەتی , بەڵام ئەوکات ڕوخساری لە پێشەوە دەبینی و ڕوخساری ئاماژەی بۆ تواناو پیاوێتی دەکرد ، چاوەکانی هەنگوینی بێ خەوش و ڕاستگۆیانە گوزراشتی ناخی دەکرد و نێوچاوانی بەرین بوو ئاماژەی بە لێهاتوویی و پیاوێتی دەکرد ، لێوەکانیشی بەردەوام خەندەیەکی گەشیان پێوە دیاربوو کە ئاماژەی بە دڵی مرۆڤێکی گەورە دەدا .
ئەمە یەکەمینجارە لە لاوە لێی بڕوانێت ..
دووبارە جارێکیتر لەلاوە لە ڕوخساری وورد بوەوە ؟ .. سەیرە ! وەك ئەوەی ڕوخساری پیاوێکی تر بێت و هەست دەکەیت لێی دەترسیت لەگەڵی هەڵ نەکەیت . حەزی دەکرد پێی بڵێت لە کوێوە هێناوتم بمگێڕەوە ، بەڵام بەبێدەنگی مایەوە.. سەیری ڕێگەکەی پێشەوەی دەکرد تاڵە قژەکانی دەبردەوە جێگەی خۆیان .
بۆ دواجار گەیشتن .. ئوتومبیلەکەی ڕاگرت .. دابەزین .. لە ژێر درەختێکی گەورەدا لەبەرامبەر یەکتر دانیشتن ، گوێی لێیبوو بە دەنگە پیاوانەکەی ووتی :
- چی دەخۆیتەوە ؟
- شەربەتی لیمۆ ..
بۆ یەکەمینجار بوو لەگەڵی بچێتە دەرەوە .. بۆچی داوای ئەوەی لێکرد لەگەڵی بچێتە دەرەوە ، لەگەڵ ئەوەی ئەو تەنها جارێک یان

دووجار بینیویەتی ؟ ئەی بۆچی قایل بوو لەگەڵ ئەوەی داواکاری زۆر کەسی بۆ ئەو مەبەستە ڕەتکردبوەوە ؟
حیکمەت دانیشت و سەرقاڵی بیرکردنەوە بوو لەو کۆمەڵە پرسیارەی کێشمە کێشمیانە لە مێشکیدا : ئایا لەبەر ئەوەیە کە ئەو پیاوە ، نێرینەییەکی پتەوی هەیە ، وەك لە دەنگیدا دەردەکەوێت و ڕوخساری و باڵا ڕێکەکەی ؟.. ئایا بە درێژایی بیست و هەشت ساڵ تەمەنی گەڕانی ئەمە ئەو پیاوەیە کە خوازیاری بووە ، ئەو پیاوەیە کە مێشک و دڵ و جەستەی دەداتێ و دڵتەنگیەکانی لا دەڕەوێتەوە و داڵغەکانی دەکات بە ڕاستی و ناخۆشیەکانی ژیانی دەسڕێتەوە ؟
سەیرێکی کردوو لە ڕوخساریدا بە شوێن ئەو پیاوەدا دەگەڕا ، گوێی لێیبوو بە دەنگە گەورەکەی ووتی :
- حیکمەت سەیری ئەم درەختە و ئەو تیشکانە بکە کە دەکەونە سەری چەندە جوانە !..
حیکمەتیش سەری بەرزکردەوە بۆ درەختەکە بینی درەختێکی گەورەبوو تیشکی ڕەنگا و ڕەنگی لێوە دەهاتە ناوەوە هەندێکیان سوور و هەندێکی تریان زەرد و سەوزیش .. پاشان ووتی :
- درەختەکە جوانە بەڵام زۆری ئەو تیشکانە جوانیەکەی دەشێوێنن .
بە هەستێکی زۆرەوە ووتی :
- بە پێچەوانەوە ، جوانیەکەی زیاد دەکەن چەند خولەکێك تیپەڕی و ئەو هەر سەیری ئەو تیشکانەی دەکرد ، ڕوخساری گۆڕا لە پیاوێکەوە بۆ ڕوخساری منداڵێکی بچووك بە شادومانیەوە دەڕوانیتە کۆمەڵێک لە ( میزلڵدان ) ی ڕەنگا و ڕەنگ .

حیکمەت شەربەتی لیمۆکەی هەڵگرت و ناو بەناو کەمێکی لێدەخواردەوە ، بینی لای کردەوە بەلایدا و بە جوڵەیەکی ناشیاو بە بەرامبەر لەگەڵ باڵا و ڕوخساری ووتی :

- تۆ جوانی ، زۆرجوانی ، هەرگیز چاوەڕوانی ئەوە نەبوو کە لەیەکەمین قسەیدا گوێی لەو ووشانە بێت .. لەبەرئەوەی هەر پیاوێک لەگەڵ ئافرەتدا دانیشێت پێی دەڵێت ( تۆ جوانیت ) ئەو چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد شتێکی تری پێ بڵێت ، شتێکی گەورە و قووڵ کە هزری بهەژێنێت ، ئەو پیاوێکی زۆر ئاساییە .. لەوە دەچێت لەوە زیاتر کە ووتی هیچی تر نەزانێت .. بەڵام دیمەنی و ڕوخساری کە گوزارشت لە هێز و قوڵایی دەکات , دەنگە زبرەکەی ، ئەو هەستەی یەکەمینجاری بۆی کە هەستیکرد ئەمە ئەو پیاوەیە کە بە درێژایی بیست و هەشت ساڵ بە شوێنیدا گەڕا ، ئایا هەستێکی ناڕاست بوو ؟.. باشە بۆچی ئێستا وا بچووك دەردەکەوێت ؟ بۆ ئاساییە ؟.. ئایا دەشێت بیەوێت لێی تێنەگات ، ئەی شارەزایی ، و پێگەیشتویی ، ئایا بە پیاوێکی ئاسایی قایل بێت ؟ بەڵام ئەو نزیك بۆتەوە لە سی ساڵ و تا ئێستا بەو پیاوە نەگەیشتووە کە خوازیاری بووە .. ئایا بێزار بێت لە دەستکەوتنی ؟.. و بەم پیاوە قایل بێت ، درێژ ، و پان دانیشتووە لە بەرامبەریدا ، چاوەکانی بەو تیشکە ڕەنگا و ڕەنگانە گەشاوەتەوە و سەمایان لەگەڵ دەکات ؟

لە ناکاو لە دەنگە قوڵەکەی ڕاپەڕی و بە ئاگا هاتەوە کە سەرنجی دەستی دەدا بە پەرداخە شەربەتەکەوە و زۆر سانایانە و ئاسایی دەیوت :

- دەستەکانت زۆرجوانن ، بچکۆلەن ... چەند جوانن ؟

پاشان وەك منداڵ دەستی درێژ کرد و ووتی :

- دەمەوێت دەستیان لێدەم ... ڕێگەم دەدەیت ؟

ئەو بە تەواوی لە ژیــان گەیشــتبوو و ئەزمــوونی تیــادا بە دەســت هێنابوو بەڵام دەیویست ئەم پیاوە تاقیبکاتەوە و بزانێت چی دەکات کاتێــک دەســتی بگریــت .. ئایــا ئەو منــداڵە دەبێت کە یــاری لەگەڵ میزڵدانەکاندا دەکات یاخود ئەو پیاوە دەبێت کە ڕوخساری ئاماژەی پێدەدات ؟

دواجار دەیویست هەلێکی بداتێ تاکو ئەوینی خۆی بسەلمێنی ، ئایا خۆشی دەوێت ؟ پاشان ئەو خۆشەویستیە چ جۆرێکە ؟ چۆن ئەو خۆشەویستیە دەردەبڕێت و گوزارشتی دەکات ؟

نەیدەویست سزای لەسێدارەدانی بدات بەسەردا لە یەکەمین چاو پێکەوتنەوە ، ئەزموون و شارەزاییەکەی وایان لێکردووە خۆڕاگر بێت و پەلە نەکات ، چاوەڕوان بێت و هیوا بنیادنێ .. چونکە تەنها ساتێک بۆی هەیە خۆشەویستیەکی نوێ دروست بکات ، وەك چۆن تەنها ساتێک بۆی هەیە خۆشەویستیەکی لەمیژینە بکوژێت ..

هەردوو دەســتە بچکۆلانەکەیــدایە ، گرتنــی و مــاچی کــردن و دەموچاوی خستە لەپەکانیەوە ، تفی قوتدەدا و گەرووی هەڵبەز و دابەزی بوو گوێی لێی بوو ووتی : خۆشمدەوێیت ..

ئەو مرۆڤێکــی مەزن و ناســك بــوو ، خــاوەن دڵێکــی گەورە بــوو ، ڕێزی هەستی مرۆڤی لابوو لەهەر جێگەیەك بێت ، و هەرچۆنێك بێــت ، بە سۆزێکی زۆرەوە سەیری کردوو بە دەنگێکی گەرمــی ڕاستگۆیانە پێی ووت :

- کاتێــک کە بینیمیــت هەســتمکرد تــۆ ئەو پیاوەیــت کە بە درێژایی تەمەنم بە شوێنیدا دەگەڕام ... بەڵام ..

بیدەنگ بوو .. نەیدەویست خورپەی بۆ دروست بکات ، نەیدەویست کارەساتی بەسەردا بدات ، سەیرێکی کرد وەك ئەوەی گوێی لێی نەبوبێت چی وتووە و وتی :

- دەســتەکانت زۆر نەرمــن .. ئەمە چــیە ؟ ئایــا لە تیشــك دروستکراون ؟

تیشك ؟!

ئەم پیاوە چیە ؟ تەنها تیشك و بریسکە دەبینێت ؟

هەستیکرد خەریکە پێی بێزار دەبێت و دەستەکانی لە دەستی دەرهێنا و لەسەر کورسیەکەی خۆی ڕێک کردەوە و بە ڕاستی پێی ووت :

- ئەوی ڕاستیبێت عەلـی .. تـۆ بە شـێوەیەکی سـەیر منـت خۆشدەوێت قسـەکانت نـاگەنە دڵـم ، بەڵکو خەریکە نـاگەنە گوێچکەم ، تۆ خۆشەویستی نازانیت ؟

بەسەرسوڕمانیکەوە سەیری کردوو ووتی :

- تۆ توڕەیت خۆشەویستم ؟ نا .. نا .. نا نامەوێت نیگەران بیت .. گوێبگرە .. ئێستا دواین نوکتەت پێدەڵێم کە لەسەر مەیمون هاتووە .. لە باخچەی ئاژەڵان مەیمونێك دەبێت ، پاشان . پێی دەبڕیت و دەڵێت :

- تکات لێدەکەم ، من حەزم لە نوکتە نیە !.. بەسەرسوڕمانیکەوە ووتی :

- نوکتەت پـێ خـۆش نـیە ؟ بـۆچی وا نیگەرانیت ئـازیزم ؟.. بـۆ بەختەوەرنیـت ؟ دیـمەن و خەنـدەی بەردەوامـت هەسـتێکی وای لا دروسـتکردم کە کچێکـی بەختەوەریـت .. خـوایە ! زۆرجـار بە دیمەنەکان تێدەکەوین !

حیکمەت خەندەیەکی کردوو ووتی :

- زۆر ڕاسـتە ، زۆرجـار دیمەنەکـان فێڵمـان لێدەکەن . مـن وامدەزانی پیاوێکی ڕەسەنیت !..

پەشۆکاو ڕاپەڕی وەك ئەوەی دوپشك پێوەیدابێت و ووتی :

- ڕەسەن ؟! واتای ڕەسەن چیە ئازیزم ؟

- مەبەستم پیاوێکی ڕاستگۆیە ..

سەرێکی هەڵبڕی بۆ درەختە پرشنگدارەکە و سـەیرێکی قۆڵەکـانی کردو ووتی :

- پیاوێکی ڕاستگۆبم ؟.. باشە لەم کاتەدا چۆن دەبمە پیاوێکی ڕاستگۆ .. لە کاتێکدا سروشت لە دەورم سەما دەکات و جوانی لەبەردەممدا دانیشتووە .. کاتەکانی خۆشەویستی بەرگەی ڕاستیەکان ناگرێت ..

بە بەزەییەکی زۆرەوە سەیری کردوو .. چی پێبلێت ؟ چۆن بۆی ڕوون بکاتەوە ؟ ئایا تێدەگات گەر پێی بلێت ساتەکانی خۆشەویستی بریتین لە زۆرترین ئەو کاتانەی ڕەسەنن و بێ خەوشن و جوانترین ساتەکانی ئەو کاتانەن کە تیایدا فرمێسکەکان دێنە خوارەوە ، فرمێسکەکانی خۆشەویستی تێکەڵ بە شادومانی و ئازار و هیوا .. بەڵام ئایا دەشێت چاوەکانی فرمێسکێکی خۆشەویستییان پێدا بێتەخوارەوە ؟

ئەو دوو چاوە ئاساییەی لەگەڵ هەر ڕەنگێکی کراوەدا سەما دەکەن ؟ ئەو دوو چاوەی کاتێک لێی دەڕوانن تەنها ڕوکاری سەرەوەی پرشنگداری بلورینی دەبینن ؟!

بە سادەییەکەوە پێی ووت :

- دیمەنت وا نیشان دەدات کە پیاوێکی جدیت ..

- من پیاوێکی سادەم ، زۆرسادەم ، شتەکان نائاڵۆزێنم : بۆچی ئافرەتان حەز بە ئاڵۆسکانی شتەکان دەکەن ؟

- بەڵام من تۆم لەسەر کارەکەت بینی .. تیایدا پیاوێکی جیاواز لەوەی کە ئێستا لەبەردەممدا دانیشتووە دەردەکەوێت ..

- ئەمە شتێکی سروشتییە .. ئایا دەشێت ئێستا چۆنم لەبەردەم کچێکی ناسك و جوان هەر بە هەمان ئەو شێوەیە بم کاتێک لە کارەکەم پیاوانێکی ڕەق لە دەورمن !

ووتی :

- مەبەستم ئەوە نیە ، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە هەمان ئەو پیاوە بێت ، نەك پیاوێکی جیاواز لەو ..

- من لە بارەی خۆشەویستیەوە تەنها ئەوەندە دەزانم کە بریتیە لە ڕوکارێکی جوان و بەختەوەری ژیان ! بریتیە لەو دەفرەی ماندوێتی کارەکانی ڕۆژانە و کۆششەکانی تێدا بەتالّ دەکرێتەوە .

- خەندە بکە ، پێبکەنە ..

لێوەکانی کردەوە و خەندەیەکی هێمنی کرد ، بەڵام دڵی دەکوڵێت بە ئەفسوسی ئەوەی وایزانی ئەم پیاوە پیاوی خۆیەتی و یەکەمین کارەسات نەبوو لە یەکەمین پیاوەوە ... بەردەوام دەگەڕا و بەردەوامیش توشی کارەسات دەبوو و هەرگیز لە گەڕانیش بێزار نەدەبوو و هەرگیزیش کارەسات چۆکی پێدا نەدەدا .

لەسەر کورسیەکە پاڵیدایەوە و ڕوانیە ئاسمان و ماوەیەکی زۆر وورد بوەوە و پاشان ووتی :

- حیکمەت نەیەت بە بیرتدا کە من کاتت پێ دەبەمە سەر. کات بەسەربردن شتێکە و شادومانیش شتێکی تر .. من نامەوێت خۆشەویستیم بکەمە کارەساتێکی درامایی فرمێسکەکانی تێدا برژێت .. من دەمەوێت خۆشەویستیم بکەمە چیرۆکێکی شادومانی هەمووی پێکەنین و خەندە بێت .. تێناگەم بۆچی ئافرەتان بەردەوام بە دوای ئازارەکاندا دەگەڕێن ؟

حیکمەتیش سەرنجی ئاسمانی دەدا ووتی :

- خۆشەویستیەك نیە بەبێ فرمێسك ، هاواریکرد :

- خوایە ! من قینم لە دیمەنی فرمێسکە .

دەستی درێژکرد بۆ درەختە پرشنگدارەکە و ووتی :

- ئەو تیشکانە ببینە .. سەیری ئەو درەختە بکە .. سروشتی جوان ببینە .. ژیان جوانە و دەیەوێت مرۆڤ بەختەوەر بکات ئیتر بۆچی مرۆڤ بە شوێن نەهامەتی و ناخۆشیدا دەگەڕێت ؟

بەردەوام بوو لە قسەکانی لەو کاتەی سەرنجی ئاسمانی دەدا :

- بەڵام هەندێکجار ئازار بەختەوەری دەدات بە ڕۆح و فرمێسکیش چێژێکی تێدایە لە چێژی خەندە و پێکەنین خۆشترە ..

بە هێمنی دەستی خستە سەر مێزەکەی بەردەمی و ووتی :

- من لەم قسانە ناگەم .

ماوەیەکی کورت بێدەنگی باڵیکێشا بەسەر بار و دۆخەکەدا ، هەستی بە دەستەکانی کرد لە دەستەکانی نزیك دەبێتەوە و گرتنی ، پەنجەکانی خستە ناو لەپیەوە و ووتی :

- حیکمەت . کاتێک یەکەمینجار بینیمیت خۆشم ویستی ، هەستمکرد تۆ ئەو تابلۆیەی دەچیتەوە سەر ئەو نەخشەیەی کێشابووم بۆ هاوبەشی ژیانم ، بۆ هاوسەرم .. هەربۆیە داوام لێکردیت لەدەرەوەی کارکەمان بتبینم . من کات بەسەر نابەم . من دەمەوێت ببیتە هاوسەرم ، ئایا قایلیت ؟

ئەو هەر پاڵیدابوەوە و چاوەکانی بە ئاسمانەوە بوون و وەڵامی نەدایەوە بەسەرسوڕمانێکەوە لێی ڕووانی و ووتی :

- بۆچی وەڵام نادەیتەوە ؟

بەسادەیی ووتی :

- تۆ تێم ناگەیت . قسەکردن لەسەر هاوسەری بوون هێشتا کاتی نەهاتووە ، من دەبینم ئێمە لە ناخەوە جیاوازیمان هەیە .. لەوانەیە تۆ دیمەنی منت بە دڵ بوبێت و منیش لەتۆدا ئەو پیاوەم بینیبێت کە بە دوایدا دەگەڕام ، بەڵام ناخ .. قوڵایی .. تێروانینمان بۆ ژیان .. هەموو ئەمانە جیاوازییەکی زۆریان هەیە .

ووتی : جیاوازی لە نێوان پیاو و ئافرەتدا شتێکی سروشتیە .

ووتی : پیاو و ئافرەت لە پێکهاتەی جەستەیاندا جیاوازییان هەیە ، ئەمە سروشتیە ، بەڵام دڵ یەکە .

ووتی : من لە قسەکانت ناگەم .

حـیکمەت کەمێـک بیـدەنگ بـوو و پاشـان شکسـت لە چاوەکانیـدا دەرکەوت و ووتی :
- بگەڕێینەوە ؟
بە تێکشکانێکەوە ووتی : چۆنت پێخۆشە .
لە ئوتـومبیلە بەتـاڵە درێـژەکەدا لەتەنیشـتیەوە دانیشـت و دووبـارە شنەبایەکی گەرم بە ناسکی و هێمنی لە پەنجەرەی ئوتومبیلەکەوە لە تاڵەکانی قژە ڕەشەکەی دەدا و دەیبردنە سەر ڕوخسار و چاوە ڕەشە خەمناکەکـانی ، و فرمێسکەکان لە نێوانیاندا بەستبووی و بە پەنـجە درێژەکانی تاڵە مووەکانی لەسەر چاوەکـانی لادەدا و لێـی ڕووانـی ، ڕوخساری لەلاوە بینی ... ئەمجارە سەری نەسورِما لەبەرئەوەی لە تەنیشتەوە دەموچاوی گوزارشت لە ڕاستی ڕوخساری دەکات .
ئەویش سوکانەکەی بە دەستەوە بـوو و داڵـغە بردبـویەوە و لە دڵـی خۆیدا دەیوت ئەو کچێکی بەفیزە و لە خەیاڵدا دەژی . لەو بڕوایەدا نەبووم ڕەتمبکاتەوە وێڕای پلە و پایە و سامانم . چەند گێلە ! ئایا هەسـت بە چێـژ ناکـات لە تەنیشـتمەوە لەم ئوتـومبیلە کەشـخەیەدا دانیشتووە .. هەست ناکات ؟
چاوەکانی ئەویش لەسەر ڕێگە دوورەکە بوو و داڵـغە بردبویەوە و دەیوت پیاوێکی بەفیزە و لە خەیاڵدا دەژی . هەرگیز بڕوام نەدەکرد بیر لە هاوسەری بەستن بکاتەوە بێئەوەی خۆشەویستی بناسێت .
هەردوکیشیان هەڵە بوون و هەردوکیشیان ڕاستبوون ..

# هیچ شتێک نەمر نابێت ..

ووشــەکە دەنگـدانەوەیەکی بەهێـزی هەبــوو لە ژوورەکەدا ... بەجۆرێک شتەکانی لەراندەوە .. لەگەڵیدا هەموو لکاندنە وردیلەکانی لەیەك دابڕاند و شتەکان ڕەنگ و قەبارە و چڕییان لەدەستدا .
چاوەکــانی بە شــوێن پزیشــکە درێــژەکەدا دەگەڕا ، یــان چــاکەتە سپییەکەی یـا مێزی پشکنینە چەرمیەکە و دیـوارە خۆڵە مێشیەکان بەڵام بێهودە .. لەبەرئەوەی ڕەش و سپی لە پێش چاویدا تێکەڵ بووە ، مرۆڤ بە بـێ گیـان و ماوەکـان بە قەبارەکـان .. هەستیکرد وەك بــابەتێکی ســەیر بە مێشــکیدا مەلە دەکــات و دەچێــتە قــوڵایی .. بەرکەوتنی وەك بەرکەوتنی قوڕ وایە و پاراوە وەك ئاو و لە ڕەشی شەویش دەچێت و قوڵایی هێندەی قوڵایی ئاسمانە .
هەسـتی بە قـورس بـوونی قۆڵەکـانی کـرد وەك ئەوەی لە لمـدا بە تەواوی نقوم کرابن . پاش چەند ساتێک چاوەکانی هەڵهێنا .. هەموو شــتەکانی لەجێگەکــانی خــۆی بینـــی و پزیشــکە درێــژەکەی بە چاکەتەکەیەوە بینـی و مێزە چەرمـی و دیـوارە خۆڵە مێشیەکانیشـی بینی ..

پزیشکەکە بە هێمنی لێی نزیکبوەوە و گوێی لێیبوو بە ئەسپایی پێی ووت :

- من وا هەستم دەکرد تۆ ئازایت ..

ووشەی ئازایەتی لە گوێچکەیدا زەنگدانەوەیەکی سەیری هەبوو .. وەك ئەوەی واتا کۆنەکەی لە دەستدابێت ..

بێئاگایانە وەڵامیدایەوە : ئازایەتی ؟!

پزیشکەکە ووتی : بەڵێ .. وامزانی ئازایت ..

ئەم ووشەیەی لە مێشکیدا چەند جارێک لێکدایەوە و لە واتای ئازایەتی دەگەڕا .

ئازایەتی چیە ؟ بژیت ؟! یا بمریت ؟!

ئازایەتی چەند ساتێک لەمەوبەر بریتی بوو لەوەی کە سوار پاس ببیت پێشئەوەی بوەستێت و کتێبێك بکڕیت بە ( 10 ) جونەیە کە هەر ئەو پارەیەش شك بەریت .. یان بە هاوڕێکەی بڵێت تۆ دوو ڕوو نیت ، یان بە سەرۆکی کارەکەی بڵێت تۆ هەڵەیت ، یا بە سەوزە فرۆشەکە بڵێت تۆ دزیت ، یان بە هاوڕێکەی بڵێت من خۆشمدەوێیت !. بەڵام ئێستا ئازایەتی بۆتە شتێکیتر .. بۆتە شتێکی مەحاڵ و لێی داوا دەکرێت ..

چۆن ئەو لە ژیاندایە هەناسە دەدات و دەجوڵێت و هەست بە لێدانەکانی دڵی دەکات خۆی بە مردوو دابنێت ؟ چۆن بێت بە خەیاڵیدا لە کاتێکدا خانە گەرمەکانی جەستەی لە ژیاندان کە خانە سارد و سڕەکانی مردن بەسەر جەستەیدا دەکشێن ..

چۆن بڕوا بکات جەستەی توانای هەڵگرتنی ژیان و مردنی هەیە لە یەك کاتدا ؟ بەڵام بۆ بڕوا نەکات ؟ ئایا پزیشکەکە دانی نەنا بە ڕاستیە تاڵەکەدا ؟ ئایا ئازایەتی کەمە تا بڕوا بەو ڕاستیە بکات ؟ یان ڕاستی کەمە تا مامەڵە لەگەڵ ئازایەتیدا بکات ؟ یا عەقلَ ، یا ئیمانی کەمە ؟..

یـاخود هەمـوو بـابەتەکە ئەوەیە کە تەنهـا خـۆ بەدەسـتەوەدانە بـۆ دەرەنجامی کۆتایی تەواو !.
دەست و قۆڵی بە قورسی بەرزکردەوە بۆ سەرسنگی و دەگەڕا بە شـوێن ( وەرەمە ) بچکـۆلانەکەدا .. پەنـجە وردەکـانی تـوانی ژێـر پێسـت و لەنێـو دەمـارە وردەکانـدا بیـدۆزیتەوە .. تـۆپێکی بچـووك هێندەی قەبارەی زەیتونێکی ووشك .. بە لەخۆباییەوە لێرە بۆ ئەوێ دێت و دەچێت ..
توپێکی بچووکی گۆشتین ، گروپێك لە خانە تورە و سەرکێشـەکان لەنێـو خۆیانـدا جیـابونەتەوە و هەڵئاوسـاون .. و بەسـەر یەکـدا تـــواونەتەوە زۆر بە تونـــدی .. شـــوێنێکی چـــاکی بۆخـــۆی دەستنیشـانکردووە و تیایـدا جێگیربـووە و لە پـاڵەوە خـانە هـێمن و ئارامەکان بە خواردن دەخوات .. چی وایکردووە ئەم خانانە تورەبن ؟ کێ ئاگری شێتی تـێ بەرداون ؟ ئایا ئەوە قەدەری زیندەوەرەکانە یەکتر بخۆن ؟! ئایـا تـابلۆی مەرگە و لەسـەر ژیـان دەژی ؟! کەس نازانێت .. نە پزیشك و نە جادوگەر و نـە پیاوانی ئاینی .. بێگومان هیچ کەسێک نیە بزانیت .
چاوە سور هەڵگەڕاوەکانی بەرز کردەوە بۆ پزیشکەکە و بێ ئاگایانە لێی پرسی :
- هیچ چارەسەرێک هەیە ؟
بە زەردەخەنەیەکەوە وەك ئەوەی بڵێت بەڵێ .. ووتی : نەخێر..
ووتی : بۆچی سنگم ناکەنەوە و ئەو تۆپە سەرشێتە دەربکەن؟
پزیشـــکەکە وەك ئەوەی ڕۆژانە بە هەزاران وەڵامـــی لەو جـــۆرە بداتەوە بە ساردیەکەوە ووتی :
- سـودی نـیە ... هەنـدێک لەو خـانە سەرشـێتانە چـونەتە خوێنەوە و خوێنیش بەرەو لیمفەکانی بردوون ..
بە هیـوایەکەوە ووتـی : ئەی بـۆچی ئەو لیمفـانە نـاکەنەوە و خـانە سەرشێتەکانی لێ دەربکەن ؟

پزیشکەکە زۆر بە سادەیی ووتی : نابێت ..

- بۆچی ؟
- ئیمە ژمارەی ئەو لیمفانە نازانین ..
- ئاخ !

بە ترسێکەوە لە پزیشکەکەی ڕووانی و ووتی : ئەی چار چیە؟..
بە ساردیەکەوە ووتی : هیچ شتێک .. چاوەڕوان دەکەین ..
بە پەشۆکاوی ڕاست بووەوە و ووتی : چاوەڕوان دەکەین ؟ چاوەڕوانی چی بکەین ؟
بەهێمنی ووتی : موعجزەیەك لە ئاسمانەوە .. یاخود دۆزینەوەیەکی پزیشکی نوێ .. یا ..
سەرلە نوێ ژوورەکە لە بەرچاوی سورِایەوە و ڕەش و سپی و مرۆڤ و بێ گیان و قەبارەکان و ماوەکان تێکەڵ بونەوە .. هاتەوە پێشچاوی منداڵێکی تەمەن نۆ ساڵانە بە شەقامێکی درێژدا دەڕوات دەیویست بزانێت بە کوێ دەگات و لە کوێدا کۆتایی دێت ، بەڵام خۆی لە چەند ڕێیانێکدا بینیەوە و ڕێگەی ماڵەوەی ونکرد .. دەستیکرد بە گریان بە شەقامەکاندا تا بە ڕێکەوت دۆزیانەوە ..
کاتێک چاوەکانی کردەوە پزیشکەکەی نەبینی . بە سەرسورِمانەوە بە چواردەوری خۆیدا گەڕا .. بۆ ساتێک وا هەستی کرد کە لە خەونێکی ناخۆشدا بوو .. خەریکبوو لە خۆشیان لەسەر سیسەمەکەوە باز بدات کە ڕزگاری بوو .. بەڵام چاوەکانی کەوتە سەر دیوارە خۆڵە مێشیەکان و مێزە چەرمینەکەی پشکنین دووبارە دەستێکی ئاسن دڵی گوشی ..
ڕاستی و خەونی لێ تێکەڵ بوو و دەستی بەرزکردەوە و کاتێک بەر وەرەمەکە کەوت ڕاستی نەهامەتی و سەرسورِمان و داڵغە هاتە مێشکی ..
چۆن دەتوانێت بژی لەکاتێکدا دەزانێت دەمرێت ؟ بەڵام هەموو خەڵکی دەزانن کە دەمرن ، بەڵام ئەوان نازانن کەی دەمرن ...

لەبەرئەوەش کە نازانن کەی دەمرن ئەوا بڕوا ناکەن .. کە بڕواش نەکەن بیریان دەچێتەوە .. لەبەرئەوەش کە بیریان دەچێتەوە دەژین ..

هەستی بە شتێک کرد لە گەردنیەوە دەئاڵێت و خەریکە هەناسەکانی دەگرێت بە خێرای هەستاو چووە نزیك پەنجەرەکە و کردیەوە و سنگی پڕ کرد لە هەوای شەقامەکە .. ئەو هەوا شێدارە کەمێک هیوا و ئارامی بۆ گێڕایەوە .. جوولەی خەڵکی لە شەقامەکەدا متمانەیی بۆ هێنا کە هێشتا ژیان بەردەوامە و کەمێک دێوەزمەی ناخۆشی مردنی بیرچووەوە ..

پالتۆکەی لەسەر مێزی پشکنینەکە هەڵگرت و نەخۆشخانەی جێهێشت بێئەوەی سەردانێکی ژووری پزیشکەکە بکات .. بە شەقامەکەدا دەڕۆیشت و خۆی لە خەڵکی هەڵدەسوو و هیوا و گەرمی ژیانی لێ داوا دەکردن و لەگەڵ خێرایی و ڕۆیشتنی ئەوان کۆتایی ناخۆشی بیر دەچووەوە .. لەگەڵ ئەو خەڵکە خۆی بینیەوە .

بە خێرایی دەڕۆیشت وەك ئەوەی بیەوێت بگاتە شەمەندەفەر یان ژوانێکی گرنگی هەبێت ، ئەگەرچی نە شەمەندەفەر و نە ژوان نەبوون .. بەڵام بێ ئامانج خۆی دابووە دەست ئەو ڕاکە ڕاکەیە .. وەك ئەوەی ئەو ڕاکە ڕاکەیە بوبێتە ئامانجێك ..

دەستیکرد بە جوڵاندنی دەست و قاچەکانی لە هەوادا و بە توندی وەك ئەوەی بیەوێت لە خانەکانی مێشکیدا بیرۆکەی مردنی ناشرین بکەونە خوارەوە .. یان وەك ئەوەی بیەوێت خانەکانی سنگی لە خانەکانی ووشکی مردن جیا بکاتەوە .

هەستی بە کەمێک حەوانەوە کرد بەو هەوڵانە ، پاشان بە هێواشی دەڕۆیشت و سەرنجی درەخت و ئاوی دەدا و سنگی پڕ دەکرد لە هەوایەکی خۆشی شێدار .. گوڵێکی سپی جوانی لە قەراخ ڕێگەکە بەرچاو کەوت .. لەبەردەمیدا وەستا و لێی وورد دەبووەوە ، بە پەنجەی دەستی لە هەڵاڵە و پەرە ناسکەکەیدا و هەستێکی سەیری لا

دروست بوو .. لووتی نزیك كردەوە و بۆنی كرد شادومانی و خۆشیەك ڕۆحی تەنی و سەوزایی قووڵی ئاسمان كە لە ئاوەكەدا پێچەوانە بوبووەوە مەستیكرد و لە نزیك دەریاكە دانیشت و پێڵاوەكانی دانا و قاچەكانی خستە سەر گژ و گیای تەڕ و پاراو ..
لە پانتایی ئەو سەوزاییەدا ڕوخسارێكی درێژكۆلەی باریك هاتە پێشچاوی .. لەگەڵ هێمنی و ئارامیەك و دوو چاوی شینی قووڵ .. لێی وورد بوەوە ئەویش بە هەمان شێوە .. لە قوڵایی چاوەكانیدا ونبوو .. بە چرپە بە ناوەكەیدادا .. بێ ئاگایانە دەستی برد بۆ گیرفانی و ئەو پارچە كاغەزەی دەركرد كە چەند ووشەیەكی لەسەر نوسیبوو بۆی و لێی وورد دەبوەوە .. كاغەزەكەی هەڵگێڕایەوە و دەستی بە پشتەكەیدا دەهێنا .. هاتەوە بە مێشكیدا بەركەوتنی دەستی بە تۆپە وشكەكەی سنگی .. پاشان ووشە قورس و ناخۆشەكانی پزیشكەكە هاتەوە گوێی . بە سەرسورِمانەوە كاغەزەكەی ناو دەستی تۆپەڵكرد .. چۆن ئەو كاغەزە ناسكە بچووكە دەمێنێت و ئەو دەمرێت ؟
ئەو پارچە كاغەزە نەمر دەبێت و ئەو لەناو دەچێت ؟ بە سەرسوڕمانێكەوە بەملاولای خۆیدا ڕووانی ..
بەڵام ئەم كاغەزە دەشێت لەناو بچێت و ئاوی دەریا بیتوێنێتەوە یاخود ئاگری ئاگردانێك بیخوات ..
بەڵام ئەو لەناو ناچێت .. دەبێتە خۆڵەمێش .. دەبێتە ماددەیەكی تر ..
بەڵام ئەم ؟ ئایا بەڕاستی لەناو دەچێت كاتێک كە مرد ؟ نەخێر .. ئەو وەك كاغەز وایە .. جەستەی دەبێت بە خۆڵەمێش ، دەبێتە ماددەیەكی تر هەموو شتێک تا هەتایە دەمێنێت .. چەند تلێكیدا لەسەر گژ و گیا شێدارەكە .. هەستی بە پەستانی وەرەمەكە كرد لە ژێر سنگیدا .. بەڵام بەبێدەنگی زەردەخەنەیەكی كردوو بیرۆكەی مردنی ناشرین و قێزەونی لەپێشچاو كەم بوبوەوە ..

# ساتوەختی ڕاستگۆیی

هەموو شتەکان لەجێگە کۆنەکەی خۆیانن .. بەشێوازە کۆنەکەی . سـەرجەم شـتەکان وەك هەمیشـە وەك خۆیـانن ... قەنەفە زەردە درێـژەکە . لە تەنیشـتیەوە هەمـان کتێبخـانە بچکـۆلانەکەیە .. لە سەریشەوە وێنەی دەریا گەورەکە هەمان وێنەیە .. چاوەکانیشی هەر هەمان ئەو چاوانەن کە لێم وورد دەبنەوە و گەورە دەبن و بچووك دەبنەوە و لە جێیەکی نەزانراوەوە تابلۆی هێمنی و ئارامی و قوڵایی و شۆرِش و ئاڵۆزی هەتایی دەریام بۆ دەکێشێت .

هەموو شتێک لە جێگە کۆنەکەی خۆیەتی . بەشێوازە کۆنەکەیەوە .. بەڵام شتێکم بەلاوە نوێ بوو .. چاوەکانم لە چاوەکانی ترازاند و بە هێمنـی دەریـاکەدا سـەرکەوتمە سـەرەوە بـۆ پەردە شـینە ئاسـمانیە ناسکەکە ..

ئەمە مـاڵی ئەوە .. بەڵـێ مـاڵەکەیەتی .. یەکەمینجـاریش نـیە بـێمە ماڵەکەی .. لەوانەیە دەیان یان سەدان جار بێت .. بیرم نەکردبوەوە لە ژماردنی سەردانەکانم بۆلای ..

قەنەفە زەردەکە .. هەمـان قەنەفە زەردەکەیە .. یەکەمینجـاریش نـیە لە تەنیشـتیەوە لەسـەر ئەو قەنەفەیە بە تەنهـا دانیشـین .. بە تەواوی هەر خۆمـان تەنهـا .. جـگە لەو ڕوخسـارە نەبێت کە هەمـوو جـار لەسـەر دیـوارە خـۆڵە مێشـیەکەوە سـەرەتاتکەی لـێ دەکـردین .. لە نـاوەوەی چوارچێـوە چوارگۆشـەکەی .. لە نێـو چاوانیشـیدا هێڵێـك

هەبوو کە دیمەنی باوکایەتی و نەوەی دەنواند .. شوشە سورەکەش هەمان شوشە سورەکەیە ... یەکەمینجاریش نیە لەگەڵیدا بخۆمەوە .. ئەویش ئەو .. خۆیەتی بە جەستەو قژ و ڕوخسار و چاوەکانیەوە هەموو ئەو سانایی و مەکرەوە .. بێگەردی و پێچەوانەکەی .. گێلیی و ژیری .. توانا و ونبوون .. سەرسوڕمان و جێگیری .. حەزی ویستن و ترسی دوو دڵی ..

منیش .. بە جەستەم و سەرم و قژم و پەنجەکانی دەستمەوە .

بەڵام شتێک گۆڕاوە ، شتانێکی نەزانراو گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە .. هەموو شتێک گۆڕاوە . وەك ئەوە وایە یەکەمینجار بێت ..

چ شتێک گۆڕاوە ؟ .. ماڵەکەی ؟ نەخێر ماڵەکەی نیە ، چونکە هەموو شتەکان لەجێگەی پێشووی خۆیانن ..

خۆیەتی ؟.. نەخێر خۆشی نیە .. هەموو شتێک تیایدا لەجێگە کۆنەکەی خۆیەتی .. درۆ لە چاوەکانیدا .. فیلَ لە لێوەکانیدا .. جلوبەرگە کۆنەکەی بەری .. ئەو جلوبەرگە مردووەی مێینەیی لە ژێردا خەفەکردووە .. تەنانەت ئەو جلەی نەگۆڕاوە . چ شتێک گۆڕاوە ؟! من ؟ نەخێر من نیم .. چونکە من خۆم دەناسم .. هێز نیە لەسەر زەوی بتوانێت من بگۆڕێت .. من پیاوێکی بە توانای سەرکەوتووم ، هیچ کەسێک ئەو تواناو سەرکەوتنەی پێ نەبەخشیوم ، بەڵکو لە نێوان گیرە پتەوەکانی جیهان پچڕیومە .. منیش ڕۆژێك لەڕۆژان مندالَ و هەژار و بێتوانا بووم ، بە پێ دەڕۆیشتم پەستانم دەخستنە سەر تا بەوانە بگەمەوە کە سوارەن .. سوربووم لەسەر ئەوەی بیانگرمەوە .. هەرواشمکرد .. بەڵام تەنها ئەوە بەس نیە بۆ من ، دەمەوێت سواربم و ئەوانیش بەدوامدا بە هەناسە بڕکێ و پێ خاوسی بێن ، پێکانیان بە خوێنەوە بێت وەك چۆن من وابووم . سەرکەوتم ، چیتر بەپێ نەڕۆیشتم .. بەڵام .. ئەوانیش سوار دەبن .. منیش نامەوێت وەك من سوار بن ، نامەوێت

هیچ کەسێک لە من بچێت .. لەبەرئەوەی کەس وەك من نیە .. نابێت هەشبێت ..
من کاتێک دەڕۆم پیاوان ڕێگەم بۆ دەکەنەوە ، ئەمە شتێکی سروشتیە .. پێویستە کەس لەپێشمەوە نەڕوات .. کاتێکیش هەر ئافرەتێکم بوێت چۆکم بۆ دادەدات و هەرچی هەیە دەمداتێ بێئەوەی هیچ شتێکی بدەمێ .. ئەمە شتێکی سروشتیە .. پێویستە ئافرەتان پێم ببەخشن بێ بەرامبەر .. ئەوەی وەك منە نابەخشێت و نادات .. گەر کەسێکیش هەبێت بدات و وەرگرێت بۆ من ئەو کەسە نەبم کە وەربگرم ؟
ئەم ئافرەتەش کە لە تەنیشتمەوە دانیشتووە .. ئایا وەك باقی مرۆڤەکانی تر نیە .. گەر ببەخشێت وەرناگرێت .. گەر وەرگرێت نابەخشێت ؟..
بەڵام ئەو گیر و ژیرە .. لەوانەیە وەك من بێت .. تەواو وەك من .. لەجۆری من .. لە بۆماوەیی من .. نادات ..
بەڵام پێویستە بەسەریدا سەرکەوم .. مەحاڵە پێویستە وای لێبکەم بمداتێ .. پێویستە !
منیش نامەوێت هەست بکەم لێی وەردەگرم .. نامەوێت هەست بکەم دەستدرێژی دەکەمە سەر .. دەستدرێژیکردنە سەر شەریفیم بیر دەهێنێتەوە منیش نامەوێت شەریف بم .. دەمەوێت چۆکم بۆ دابدات و لێم بپاڕێتەوە و بمداتێ .. بەڵکو دەمەوێت تکام لێبکات تا ئەو پێدانەی لێ وەرگرم ..
من وا بە درِندەیی لە دایك نەبووم .. باوکم پیرۆز بوو . دایکشم قەشە بەڵام ژیان خۆی بە درِندەیی لەدایکبووە .. کاتێک کە منداڵبوم ژیان دڵۆپێک شیری گەرمی دایکمی لێ قەدەغە کردم . بە ملیمێکی سور کیسێك شیرم دەکڕی و بە نوکی پەڕەکەی سەلیم نەهامەتیم دەنوسیەوە .

ئەم ئـافرەتە ناشـرینە فـێڵاویە ژیـرە ! چـی وایلێـدەکات لە مـاڵەکەی خۆیدا بە تەنها لەگەڵم دانیشێت و لەگەڵم بخواتەوە ؟
ئایا دەیەوێم ؟ نەخێر .. دەنا چی ڕێی لێدەگرت جارانی پێشوش ؟
ئایا توانای خۆی تاقیدەکاتەوە یان توانای من ؟
ئەو سەیرم دەکات .. لێم ورد دەبێتەوە .. لە ڕوخسارم دەکۆڵێتەوە .. هێڵەکـانی لـوتمی هەمـوو دەرخە .. سـەرنجی ددانەکـانم دەدات .. تەنانەت کاتێک قژیم گرت و ڕامکێشـا تـا لێوی بنێم بە لێومەوە .. لەو کاتەی خەریکبوو وون دەبووم چاوەکانی کرابونەوەو بێ خەوش لێیان دەڕوانیم !..
ئافرەتێکی ناشرینی فێڵاوی هیچ ! وەك ئافرەتـانی تـر لە هۆشـخۆی نەچوو ؟ بۆچی ؟.. ئەم ئافرەتە درۆزنەی یاریم پێدەکات !
مـن درۆ لەگەڵ هەمـوو خـەڵـک دەکەم .. سـەیری هەمـوو کەسـێک دەکەم .. بەڵام ئەوە مافی خۆمە .. ئەمە سروشتیە و من ئازادم .. کە مافی ئەوەی نیە و توێژم لەگەڵبکات ..
بەڵام ئافرەتێک هەبێت لەمن بچێت ؟.. ئـازادی پەیڕە و بکـات وەك من ؟.. درۆ پەیڕەو بکـات وەك مـن ؟.. پێویستە ئەو ئـافرەتە لە نـاو ببرێت ! من توانای لەناو بردنیم هەیە ..
ئەم گیـرییە بەپۆزە ! فێـری دەکەم مـن کێم ! وای لێدەکەم بەردەوام منـی بیربێـت .. هەرکـاتێکیش منـی بیـرکەوتەوە وەك ئەوە وابێـت سـەرلە نـوێ خـنجەرە ژەهـراویەکە بچێـتەوە بە دڵیـدا .. ئەو خەنجەرەی دام لە کەرامەت و کەسێتی و مێینەیی ..
کەسـێتی ! ئایـا ئافرەتێـک هەیە بە نـاو کەسـێتی هەبێـت ؟ ئەوانە ئافرەتانێکن دڵسۆزییان تەنها بۆ ئەو پیاوانەیە کە خیانەتیان لێدەکات .. تەنها پیاوانی دڵسۆزیش خیانەت دەکەن .. لە ئافرەتان , بەڵام من چـۆن ئەوەم زانـی ؟ چـۆن ئەو ڕاسـتیەم زانـی ؟ .. لەوەوە بۆمدەرکەوت .. کە هەرگیز بیر ناچێتەوە ، ئەو تاکە ئافرەتەی بۆی دڵسۆز بووم و هەر ئەویش خیانەتی لێکردم ! بۆچی هەرگیز بیرم

نـاچیتەوە ؟ بـۆچی ؟ ئایـا لەبەرئەوەیە کە بە تەنهـا هەر ئەو بـوو ڕەتیکردمەوە ؟ یان لەبەرئەوەی بە تەنها ئەوە بواری ئەوەی نەدامێ ڕەتیبکەمەوە؟

ئەو سەیرم دەکات .. پێکێکیشی بە دەستەوەیە .. و من لە تەنیشتیەوە دانیشـتووم .. لەماڵەکەیـدا .. و هەمـوو شـتێکیش لەجێـی پێشـووی خۆیەتی ..

بەڵام شـتێکی نـوێ هەیە .. لە کوێـدا ؟ لە کوێـدا ؟ .. لە وێـنەی دەریاکەدا ؟ لەسەر ڕەفەی کتێبەکان ؟.. لەسەر دیوارە خۆڵەمێشیەکە ؟.. لە پێکـی خـواردنەوەکەدا ؟ لە چاوەکانیـدا , لە چـاوە گیـرە فێڵاویەکـانیەتی .. بەڵـێ لە چاوەکانیـدایە .. شـتێکی نـوێ ، شـتێکی سەیر ، شتێکی وەك فرمێسك .. لە ڕاستی دەکات !.

ڕاستگۆیی ؟ چۆن ئەو ووشەیەم بە بیردا دێت ؟ یـان چۆن بەبیری ئەودا دێـت ؟ ئایـا چاوانێـك توانـای ئەوەیـان هەیە هەڵگـری درۆ و ڕاستگۆیی بن لە یەك کاتدا ؟

ئایا بڕوای پێبکەم ؟ وەك ئەوەی خۆشـی بوێم .. ئـای کە ئـافرەتێکی لەخۆباییە ! دەیویست فیلم لێبکات ئیدی خۆشی ویستم ..

بەڵام ئایا دەکرێت بڕوا بە تێروانینەکانی بکەم ؟ نەخێر .. ئەو درۆ دەکـات . ئـای بـۆ ئەو ئەکـتەرە بەڕێـزە ! لە چاوەکانیـدا درۆیەکـی گەورە هەیە ! ئایا ئافرەتێک هەیە خۆشەویستی بزانیت ؟

چەندم حەز دەکرد بڕوا بکەم .. بڕوا بە ساتێک بکەیت .. دەمەوێت هەست بە خۆشەویستیەکی ڕاستەقینە بکەم .. دەمەوێت شـەریف بم .. لەناخمدا گڕوتینێکی گەورە هەیە لە شەرەف .. و خۆشەویستی .. و ڕاسـتگۆیی .. بەڵام بەکێـی بـدەم؟ بەکـێ ؟ کێـیە ئەو کەسـەی شایەنیتی ؟

مـن . مـن بیـرم هەر لای بەخشـینە ! مـن بیـر لە خۆشەویسـتی دەکەمەوە .. و شەرەف .. و ڕاستگۆیی ؟..

ئایا من ؟ ئایا من دەگۆڕێم ؟ دەگۆڕێم ؟ چۆن .. کەی ؟ بۆچی؟ ئاخ .. هیلاکبووم .. بێزاربووم لەدرۆکردن .. لە دەستبرِین .. لە فیلَ .. لە قین .. من بیری ڕاستگۆیی و .. خۆشەویستی دەکەم!..
ئەو خۆشی دەوێم .. بەڵێ خۆشی دەوێم .. لە چاوەکانیدا ڕاستی دەبینم .. ئێستا .. لەم ساتەدا لێم نزیکدەبێتەوە .. نزیك بوەوە .. دەستی بەر دەستمکەوت .. شتێکی پتەو پاڵم پێوە دەنێت بەرەولای .. بەڵام شتێکی بەهێزتر دەستم لە دەستی ڕادەپسکێنێت ..

- نەخێر .. هیچ شتێک ڕوو نادات .. من دەرِۆم !
- مەرِۆ .. هەموو شتێکت دەدەمێ !
- هیچم لە تۆ ناوێت ..
- بەڵام تۆ دەتویست .
- دەمویست ..
- تۆ درۆزنیت ..
- بەڵێ من درۆزنم ..

خۆمم لەنێو ئامێزی گەرمی دەرباز کردوو بەرەو دەرگاکە رۆیشتم .. پێویستە لەم ساتەدا هەڵبێم تا ویستم نەتواوەتەوە .. پێویستە هەڵبێم تا نەچووم بەلایدا ..
دەرگاکەم کردەوە و چوومە دەرەوە .. بە شەقامە ساردەکەدا ڕۆیشتم ..
ئەوە چیمکرد ؟ ئایا من نەبووم دەمویست ؟ ئایا پلانم دانەدەڕشت تا پێی بگەم ؟ کاتێکیش ساتوەختی هات کشامەوە؟ بەڵام من هەستم بە شتێکی نوێ کرد .. شتێک لە ڕاستگۆیی دەکرد لە چاوەکانیدا . و شتێکیش لە ناخمدا لە ڕاستی دەکرد .. ساتێکی چاوتروکاندن بوو هەڵیگرتم لە ڕاستگۆییەوە بۆ خۆشەویستی و لەویشەوە بۆ شەریف بوون و پاشان کشانەوە ..
بەڵام هەرگیز ناگەڕێمەوە لای .. لەبەرئەوەی من ناتوانم بەردەوام ڕاستگۆبم .. چونکە ژیانی دڕندە لە دێر زەمەنەوە لە ڕێگەی خۆی

هەڵیگرتووم . و زۆر لە ڕاستگۆیی دوور کەوتومەتەوە .. و ناتوانم بگەڕێمەوە .. ناتوانم .. لەسەرەتاوە زۆر دورکەوتومەتەوە .. و زۆر لە کۆتاییەوە نزیکم ..
بیر خۆمی دەبەمەوە .. لەمڕۆوە .. دوای ساڵێک .. بەڵام من بێگومان لە ڕلاەوڕەوەی ژیانمدا بیرم دەچێتەوە .. بەڵام تەنها شتێکم بیرناچێتەوە .. ئەویش ئەوەیە کە من وێڕای سوربوونم دەمتوانی ساتوەختێکی تەواو بە ڕاستگۆیی بژیم کە حەزێکی زۆرم بۆی هەبوو لە هاتنە دیدا و بۆ ماوەیەکی زۆریش ..

# دوای خواردنی ئیوارە پیاوەکە نوست

لەوکاتەی لەسەر کورسیە ئالَتونینەکە دانیشتبوو و بەرزاییەکەی لە ئاستی سەری خەڵکەکە بوو لە روخساری خەڵکی

ورد دەبوەوە .. سەریسورِما چۆن ئەو خەڵکە سەرنجی قاچەکانی دەدەن بە ریز و نەوازشەوە لەگەڵ ئەوەی بیری چووە پێڵاو لەپێ بکات .
چۆن بیری نەبووە پێڵاو لەپێ بکات ..
ئەوە ئەو پرسیارە بوو کە لە مێشکی خۆیدا دەیهێنا و دەیبرد خەریك بوو تووشی خورپەی دەکرد کە سەرنجی قاچەکانی خۆیی دەدا بەپێی خاوسی شۆرِبونەتەوە لە کورسیە ئالَتونینەکەوە .
هەستیکرد دەموچاوی عەرەقی لی دەچۆڕیت کاتێک پەنجەکانی قاچی بینی پیس بوون و نینۆکەکانی رەش ، سەریسورِما چۆن بیری چووە پێڵاو لەپێ بکات پێش ئەوەی لەماڵەوە بێتە دەرەوە ، لەگەڵ ئەوەی بەردەوام و بۆ ماوەی چل و پێنج ساڵ لەپێی کردووە پێش هاتنە دەری لە ماڵ .. زیاتریش سەریسورِما کاتێک بینی خەڵکی بەرِیزەوە لە قاچەکانی دەڕوانن.
تێروانینە پرسیاراویەکانی لە نێوان قاچەکانی و روخساری خەڵکەکە دەگواستەوە و بەشوێن راستیەکاندا دەگەرِا و دەیویست بزانیت کێ نابینایە .. چاوەکانی ئەم یان چاوی خەڵکی .. بەڵام نەیتوانی .. چۆن هەرخۆی بە تەنها دەتوانێت بزانیت ؟ پێویستە دادبینێك هەبێت .. هەوڵی بۆ ڕاستیەکان وای لێکرد بە پەنجە بچکۆلەی بانگهێشتی سەرۆکی بەردەستی دیوان بکات و ئەو پیاوەش دەستبەجێ بەو بانگکردنە لە جێگەی خۆی ڕاپەڕی و بە سوجدەوە چووە پێشەوە .. بە زمانێکی پادشایانە و گەورەییەوە ئاماژەی کرد بۆ قاچەکانی و وتی :

- ببینە !

چاوەکانی کابرا بە ترسێکەوە چوونە سەر قاچەکانی و بە نەوازشەوە وتی:

- بینیم قوربان !

بە توڕەییەوە وتی : خێراکە !

کـابراش بە دەنگێکـی پچـڕ ِپچـڕی پـڕ لەرزەوە وتــی : قوربــان دەتانەوی چی بڵێم ؟
بە شپرزەییەکەوە وتی : ئەوە بڵێ کە چاوەکانت دەیبینێت !
کابراش چەند جارێک پێڵوە پڕ ترسەکانی جوڵاند و وتی : قاچەکانی جەنابتان دەبینم خاوەن شکۆ .
بە توڕەییەکەوە هاواری کردوو وتی : تۆ نابینایت ؟ ئایا هیچ شتێکی سەیریان تێدا بەدی ناکەیت ؟
کابرا بە پەشۆکاویەوە وتی : سەیر ؟
نەخێر .. نا قوربان !
کەمێک حەوایەوە و هێمن بوەوە و پاشان پێی وت :
- ڕەنگی پێڵاوەکانمت پێ چۆنە ؟
کابراش ئارامیەکی تێ گەڕاو وتی :
- زۆر شتێکی جوانە خاوەن شکۆ ! بەڕاستی بێ عەیبە !
خەنـدەیەك هـات بە ڕوخسـاریدا و پاشـان پێـی وت : بـڕۆ .. کـابرا ڕۆیشت.
دوبارە لەسەر کورسیە ئاڵتونینەکە دانیشتەوە بە لەخۆ بوردوییەکەوە و دوبارە قاچەکانی بەبێ پێڵاو بینی و گومانی پەیداکرد .
چۆن دڵنیابێت ؟ پێویستە دادبینێکی تر هەبێت .
ئامــاژەی بــۆ پیــاوی دووەمــی بەردەســتی کــرد و هەمــان ئەو پرسـیارانەی پیـاوی یەکەمـی لێکـردەوە و ئەو پیـاوەش هەمـان ئەو وەڵامانەی پێشووی پیاوەکەی یەکەمی دایەوە .. لە پیاوی سێهەم و چــوارەم و پێــنجەم و تەواوی پیاوەکــانی پرســی .. هەمــوو یەك وەڵامیان هەبوو .
لێرەدا گومانەکەی ڕەویەوە .. بۆی ئاشکرابوو کە پێڵاوی لەپێدایە .. هەستکردن بە لەپێ نەکردنی پێڵاو تەنها هەستێکی نادروست بوو و هیلاکی وای دەکرد وا هەست بکـات .. پاشـان ئەو دودڵـیەی شـەوی ڕابـردووی هـاتەوە بیـر ، کە مێشـکی هـیلاك کـرد .. وێـڕای ئەو

باوەشـــێنەی لە پەڕی وشـــترمل دروســـتکرابوو و بەدەســـت و پەنجەیەکی ناسکی ورد باوەشێنی پێدەکرا ، لەناو ئەو جێگە گەرم و نەرمەدا و تـا و نـا تـاوێکیش دەسـتی دەبـرد جەسـتە ناسـکەکانی پێدەگرت ..

تـاو نـا تـاوێکیش گـوێی لێدەبوو لە تاریکـای ژوورەکەدا و کاتێـک دەستی بەسەر ئەو جەستە ئەندامی و ناسکانەدا دەگێڕا و بە توندی بەرە و لای خۆیی ڕادەکێشا ..

دەنگێک بە هێمنی دەیوت :

- قاچەکانت بۆ بشێلم خاوەن شکۆ ؟

ئەویش بە چاوی نوستوەوە و بە تەمبەڵیەکەوە دەڵێت :

- بەڵێ .. بەڵێ ئافرەت بیانشێلە .

دەکرا ئەو شەوەش وەك هەموو شەوانی دیکە بێکێشە برۆشتایە گەر بیـری نەکەوتـایەتەوە چاوەکـانی کـردەوە .. سـەرنجی ڕوخسـاری ئافرەتەکەیدا و هاواریکرد :

- برۆ ئافرەت ! بەسە !

پاشان سەرۆکی بەردەستەکانی بە توڕەییەوە بانگ کردوو وتی :

- لە کوێیە ؟

کابراش بە ترس و لەرزیکەوە وتی : خاوەن شکۆ هاتنی بۆ ئێرەی ڕەتکردەوە !

هێندەیتر قینی هەستا و وتی : قایل نەبوو !؟ چۆن ؟ پێت نەوت ئەوە ویستی پادشایە ؟

وتی : بەڵێ خاوەن شکۆ .. بەڵام ڕەتیکردەوە ..

ڕاپەڕی و هـاواریکرد : پێـت نەوت دەتـوانم دەسـتبگرم بەسـەر ماڵەکەیداو لە مەملەکەت بیکەمە دەرەوە ؟

وتی : بەڵێ خاوەن شکۆ .. بەڵام ڕەتیکردەوە ..

لە توڕەییدا تەقیەوە و وتی : پێت نەوت توانـام هەیە سـەربازەکانمی بۆ بنیرم و بە قژ ڕاکێشان بیبەنە بەر قەنارە ؟

وتی : بەڵێ خاوەن شکۆ .. بەڵام ڕەتیکردەوە ..
ڕاپەڕی و وتی : ئەمە چۆن ؟ ئافرەتێک لە خاکمدا بێگوێیم دەکات ؟!
من خۆم دەچمە لای .. ئەسپەکەم بۆ ئامادە بکە ..
وتی : فەرمایشتە خاوەن شکۆ ..
پادشا سوار ئەسپەکەی بوو و بە ڕێگە درێژەکەدا بە تاریکایی شەو ڕۆیشت.. دەرگا و پەنجەرەی خانوەکەی بینی داخراون .. دەرگاوانەکە لە پەنجەرەیەکی بچکۆلانەی دەرگاکەوە سەری بۆ دەرهێنا ..
بە دەنگێکی فەرمان ئاسای شاهانە وتی : بیکەرەوە ! من پادشام !
پیاوەکە دەرگاکەی کردەوە هەڵدەلەرزی .. پادشا لە ئەسپەکەی هاتە خوارەوە و بە ڕێڕەوە تاریکەکەی خانوەکەدا ڕۆیشت تا ڕۆشناییەکی بینی لە یەکێک لە ژوورەکانەوە دەهاتە دەرەوە .. بەبێدەنگی و هێمنی لە دەرگاکەوە بینی ئافرەتە شۆخ و شەنگەکە لەسەر قەنەفەیەکی سەوز ڕاکشاوە و لە تەنیشتیەوە پیاوێک هەیە .. نەخێر .. پیاوێکی لە ئامێزدایە !
پادشا ڕاوەستا .. توانی ڕوخساری پیاوەکە بناسێتەوە .. زانی پیاوێکە لە پیاوانی میللەت ..
پادشا بەبێدەنگی و بە شاراوەیی وەك چۆن ڕۆیشت هەرواش گەڕایەوە بۆ کۆشکەکەی ، پیاوانی بەردەستی هەموو کۆکردەوە و بڕیاریدا پیاوەکە لەسێدارە بدرێت و سەرەکەی لەسەر سینیەکی ئاڵتونین بێتە بەردەمی و سەری پیاوەکە لەسەر سینیەکی ئاڵتونی هاتە بەردەمی .. پادشا بە شادومانیەکەوە لێی ورد بوەوە و پێی وت :

- تۆبوی لەسەر ڕێگەم وەستابوی هەی مارمێلکە !

پادشا لەسەر جێگەکەی ڕاکشا و فەرمانیدا ئافرەتەکە بێتەلای . نێردراو بە لەرزەوە هاتەوە وتی : خاوەن شکۆ ڕەتیکردەوە ..

پادشا بە توڕەییەوە هەستاو سوار ئەسپەکەی بوو و بە نهێنی چوەوە ماڵی ئافرەتەکە .. بە هەمان شێوە لە دەرگاکەوە سەیری کرد بینی ئافرەتە شۆخ و شەنگەکە لەسەر قەنەفەیەکی سەوز ڕاکشاوە و پیاوێکی لە ئامێزدایە !

وەك شێت گەڕایەوە و فەرمانیدا بە هێنانی سەری ئەو پیاوەکە لەسەر سینیەکی ئاڵتونین .. پاشان سێهەم .. چوارەم .. پێنجەم تا کۆتایهات بە سەرجەم سینیەکانی کۆشك ..

پادشا سەریسوڕما و ناردی بە شوێن سەرجەم ژیر و شارەزایانی وڵاتدا ..

شارەزا هات و چووە بەردەست پادشا و تەواوی چیرۆکەکەی بۆ گیرِایەوە و لەسەر لێوی شارەزا و زانا خەندەیەکی سەلیقەیی و کارامەیی زانست و فەلسەفە کێشرا و وتی :

- خاوەن شکۆ ، ئەو ئافرەتە هاتۆتە ئێرە تاکو کۆشك و دەسەڵات و بەردەستت ببینێت ؟
- پادشا وتی : نەخێر ..
- زانا وتی : کەواتە خاوەن شکۆ ئەو تۆ ناناسێت و نازانێت سامان و دەسەڵاتت چۆنە ؟
- پادشا وتی : تۆ چی بە باش دەزانیت ؟..
- زانا وتی : پێم باشە بانگ بکرێت بۆ ئێرە تاکو ئەو سامان و کۆشك و دەسەڵاتەت ببینێت و چۆکت بۆ دابدات ..

پادشا زۆر دڵشاد بوو و بڕیاریدا ئاهەنگێکی گەورە ساز بکات و بانگی بکات..

پاشان پادشا لەسەر کورسیە ئاڵتونینەکەی دانیشت و زانا ئافرەتەی گێڕا بە کۆشکدا و تەواوی دەسەڵات وسامان و خشڵی نیشاندا و بردیە لای پادشا ..

پادشا فویکردە خۆی لەسەر کورسیە ئاڵتونینەکەی بەرزیەکەی لە ئاست سەری خەڵکیدابوو ..

پێیوت : بۆچی بێ گوێیت دەكردم ؟..
بە سەرسوڕمانێكەوە سەیری كردوو وەڵامی نەدایەوە ..
بە توڕەیی هاواریكردوو وتی : بۆ سەرت سوڕماوە ؟ بۆ وەڵام نادەیتەوە ؟
بەبێدەنگی وتی : سەرم سوڕماوە كە قاچەكانی پادشا بەبێ پێڵاو و بە پێی پەتی دەبینم !
پادشا لەسەر تەختەكەی بە شپرزەیی هەستا ..
پاشان چاوەكانی كردەوە و لە سەرینە پیسەكەی ژێر سەریدا بینی و گوێی لە پرخەیەك بوو لە تەنیشتیەوە .. بینی لایەوە وەك جەستەیەكی بێ گیان ڕاكشاوە وەك هەموو شەوێك ماوەی بیست ساڵە ..
چرنوكێكی لە شانی گرت و بە توڕەییەوە وتی :
- كوپێك ئاوم بدەرێ ئافرەت ..
ئافرەتەكە لەبەر خۆیەوە بە خەواڵویی دەنگە دەنگێكی كردوو دەستیكردەوە بە پرخەپرخ ..
دوبارە چرنوكێكی لە شانی گرتەوەو بە توڕەییەوە وتی :
- هەستە ئافرەت تینومە .. خوا هەناسەت ببڕێت وەك هەناسەی منت بڕی بە خواردنی چەوری ئێوارەت !
ئافرەتەكە لەسەر جێگەكە هەڵگەڕایەوە و بۆڵە بۆڵێكی كردوو و هەستاو خۆیدا بەسەر شانی سیسەمە ڕەشەكەدا و بەبێزاریەكەوە لەبەرخۆیەوە وتی : بۆ خۆت ئاو ناخۆیتەوە گوێرەكە !.. پاشان ڕۆیشت تا ئاوی بۆ بهێنێت ..

# لەیلا شوو دەکات

## شانۆگەریەك لە یەك بەش

کەسێتیەکان

لەیلا : کچێکی تەمەن ( 27 ) ساڵان . جوانیەکی مام ناوەند لەگەڵ ئەوەی خەرجیەکی زۆر دەدات بە ماکیاج و ئارایشت .. ڕۆژنامە نوسێکی دەرکەوتوە ، خۆی ئامادە دەکات بۆ مارە برِینی ..

دیدی : پوری لەیلایە . ئافرەتێکی تەمەن ( 40 ) ساڵانە .. قەڵەوێکی نەخوێندەوارە و دەوڵەمەندە دەیەوێت ( مۆدێرن ) دەرکەوێت ..

سوهێر : کچێکی تەمەن ( 20 ) ساڵە خوێندکاری کۆلیجی پزیشکیە . کچی دیدیە . جوانە وێڕای ئەوەی سادەیە ..

مەحمود : کوڕێکی ( 34 ) ساڵە .. ئەندازیارێکی سەرکەوتووە .. دەزگیرانی لەیلایە ..
دیمەنەکان
ژووری پێشوازی و ناومالێکی تێروتەسەل ، مالی دیدی .. لەیلا کراسێکی سپی لەبەردایە و لە ناوەڕاستی ژورەکەدا وەستاوە و دیدی بەدەوریدا دێت و سەیری کراسەکە دەکات ..
دیدی : زۆرجوانە لەیلا ! زۆر ! پێم نەوتیت ئەو خەیاتە دەست ڕەنگینە ؟..
لەیلا : ( بە شادومانیەکەوە و لە ئاوێنەکەدا لەخۆی ورد دەبێتەوە ) پورە دیدی زەوقت جوانە . بەرِاست تۆ کەسێک هەیە نەیناسیت ئاوا چاك نەبێت .
لەیلا : ( بەرەو لای دیدی بە پێزانینەوە ) : پورە دیدی نازانم چۆن سوپاست بکەم ..
دیدی : ئێستا لە کراسەکە بوینەوە ، ماوەتەوە کارتی دەعوەتەکان ..
لەیلا : بەڵێ کارتەکان ماوە ..
لەیلا : ( ڕادەکات بۆ جانتاکەی و کیسێك دەردەکات کارتەکانی تێدایە ) .. ببینە پورە دیدی .. ( 50 ) کارتم ئامادە کردووە ..
دیدی کارتێک دەگرێت بە دەستەوە و کەمێک سەرنجی دەدات..
دیدی : جوانە .. ئێستا کێ بانگ دەکەیت لە هاوڕێکانت ..
( لەیلا کەمێک بیر دەکاتەوە پاشان کاغەز و قەڵەمێك بە دەستەوە دەگرێت و چەند ناوێك دەنوسێت ) ..
لەیلا : یەکەم فیفی و مێردەکەی ..
( دیدی لێی نزیك دەبێتەوە و لە تەنیشتیەوە دادەنیشێت ) ..
دیدی : فیفی و مێردەکەی ؟ ئەوان کێن ؟ تۆ هەرگیز پێشتر ئەو ناوانەت پێ نەوتووم ..
لەیلا : فیفی ئافرەتێکی ڕازاوەیە تەنها جارێک لە ڕۆژنامە بینیم جێگری سەرنوسەر بە یەکتری ناساندین و دەعوەتی خواردنەوەی

قــاوەم کــرد لە ژورەکەی خــۆم .. هــات و زیــاتر لە چارەکێــک بەیەکەوە دانیشتین ..
دیدی : ئەی مێردەکەی ؟
لەیلا : مێردەکەی بەرِێوەبەری یەکێکە لە کۆمپانیا گەورەکان .. ئامادەبونی ئەوان سەربەرزیە بۆ من ..
دیدی : زۆرچاکە کێی تر جگە لەوان ؟
لەیلا : بێگومان سوعاد خان و مێردەکەشی ؟..
دیدی : بێگومان .. سوعاد خان خانمی پلە یەکی کۆمەڵگەیە .. ئەو زمانی فەرەنسی دەزانێت و سکرتێرەی ڕێکخراوی ئەوانەی تووشی نەهامەتی بوون .. بەڵام تۆ دەڵێیت دێت ؟
لەیلا : بێگومان ئەو ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنوس دەپەرستێت ، گەرنا چۆن ڕۆژنامەکان ڕۆژانە هەواڵەکانی بڵاودەکەنەوە ؟.. من جارێک بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ کرد لەپێشدا زۆر توندبوو لەگەڵم بەڵام کە خۆم پێ ناساند ڕۆژنامەنوسم زمانی زۆر لەگەڵم گۆڕاو گەر بە تەلەفۆن نەبوایە لە ئامێزی دەگرتم .
دیدی : ئە ی مێردەکەی ؟
لەیلا : نا .. مێردەکەی کەسێکی گرنگ نیە بەڵام دەچێتە دڵەوە و سوعاد خان وەك سەگێکیماڵی سەیری دەکات لە هەموو جێیەك ..
دیدی : زۆر باشە ، کێی تر ؟
لەیــلا : عەزمــی و هاوســەرەکەی .. عەزمــی لە بەشــی هەواڵ کاردەکات لە ڕۆژنامە ، هاتنیشی بۆ ئاهەنگەکە دڵنیام دەکاتەوە کە بۆ ڕۆژی دواتر هەواڵەکە بڵاو دەکاتەوە لە ڕۆژنامە ..
دیدی : زۆرباشە .. لەیلا بیرۆکەکانتم زۆر پێ جوانە ، تۆ ژیریت لە پورە دیدیەوە بۆت ماوەتەوە .. بڕوا دەکەیت لەیلا تۆ زیاتر لەمن دەکەیت تا سوهێری کچم ..
لەیلا : بێگومان پوری .. چونکە سوهێر لە باوکی دەچێت ..

دیدی : ڕاستە .. بۆ نەهامەتی من چۆتەوە سەر پورە زەکیەی ، بیهێنە پێشچاوی خۆت لەیلا ماوەی بیست ساڵە دەمەوێت ژیانی هاوسەریم پێش بخەم و گرنگی پێبدەم بەڵام بێ هودەیە ، جوتیار بە درێژایی تەمەنی هەر جوتیار دەبێت .. خوێندن هیچ سوود و گۆڕانێکی بە مێردەکەم نەگەیاندووە ..

لەیلا : گوێی مەدەرێ پورێ .. بەهەرحالٙ شانسی تۆ لە شانسی دایکم باشترە . لانیکەم مێردی تۆ دەوڵەمەندە ..

دیدی : ماڵی وێرانم هەر ئەوە مابوو هەژاریش بێت تا ببینە پەندی زەمانە .. من چەند قینم لە نابینایيە هێندە قینم لە هەژارییە ..

لەیلا : بەڵام دایکم حەزی لە هەژارییە ..

دیدی : گێلە .. بە درێژایی تەمەنی گێل بووە لەگەڵ ئەوەی ( 3 ) ساڵ لە من گەورەتریشە ..

لەیلا کەمێک بێدەنگ دەبێت و داڵغە دەیباتەوە ..

دیدی : ( دەدات بەسەر شانیدا ) نیگەران مەبە لەیلا .. داوای لێبوردن دەکەم کە وا بە باوکت دەڵێم ..

لەیلا : هەرگیز .. من بیر لەوە ناکەمەوە .. بەڵکو بیر لەوە دەکەمەوە چۆن باوك و دایکم بە دەزگیرانەکەم بناسێنم ..دەموچاوم سوور دەبێتەوە هەرچەند بیری لێدەکەمەوە .. بەڵکو بیر لەوە دەکەمەوە چۆن ئاهەنگ بگێڕم لە شوققە بچکۆلانەکەماندا لەو گەڕەکە قێزەونە ..

دیدی : هیچ خەمێکت نەبێت لەیلا .. ماڵەکەم لە خزمەتدایە ..

لەیلا : ( بە نەوازشەوە لێی دەڕوانێت و باوەشی پێدا دەکات ) : پورە دیدی سوپاست دەکەم .. نازانم بێ تۆ چیم بکردایە .. بەڵام چی لە دایکم بکەم ؟..

دیدی : دەتوانێت یەکێک لە کراسەکانی من لەبەر بکات ..

لەیلا : بەڵام ئەو هەرچۆنێك خۆی بگۆڕێت نازانێت قسە بکات .. خۆزگە تۆ دایکم بویتایە !

لەیلا : ( لەبەر خۆیەوە ) ئاخ ، گەر خەڵکی خۆیان باوکان و دایکانیان دەستنیشان بکردایە ..

زەنگی تەلەفۆنەکە لێدەدات ..

دیدی ڕادەکات و هەڵیدەگرێت ..

دیدی : ئەلو کامیلیا چۆنیت . لەیلا لێرەیە . بەسەرچاو بانگی دەکەم .

( لەیلا بانگ دەکات ) : لەیلا کامیلیایە ..

لەیلا : ( تەلەفۆنەکە وەردەگرێت ) ئەلو ..

- سوپاست دەکەم ..
- ها ها ها ..
- هەرگیز ..
- دەمێکە بیستوومە ..
- کەمێک ..
- انشاءالله ..
- بەڵێ..
- خوات لەگەڵ ..

دیدی : چیە مەسەلە .. کامیلیا بانگ ناکەیت ؟

لەیلا : بێگومان نەخێر . شێتبووم تا بانگی بکەم ..

دیدی : بۆچی ؟ ئەوەی من بیزانم هاوڕێیەکی خۆشەویستتە .. من بەردەوام گوێم لە ناوی ئەو بوو لەسەر دەمت ، تۆ شەو و ڕۆژ لەگەڵی بویت .. هیچ ڕویداوە لە نێوانتاندا ؟

لەیلا : نەخێر هیچ ڕوینەداوە . ڕاستە کامیلیا هاوڕێمە ، بەڵام ئەوە پێش شوکردن ، بەڵام دوای شوکردن پێویستە هاوڕێی تر هەڵبژێرم ..

دیدی : ئەی هاوڕێ کۆنەکانت ؟..

لەیلا : تەنها ئەوانەیان لێ هەڵدەبژێرم کە لەگەڵ ژیانی نوێمدا دەگونجێن..

دیدی : ئەی کامیلیا لەگەڵ ژیانی نوێتدا ناگونجێت ؟
لەیلا : نەخێر ..
دیدی : بۆچی ؟
لەیلا : کامیلیا شووی نەکردووە و ئەوە وای لێدەکات جێگەی مەترسی بێت بۆ من .. ئەمە وێڕای ئەوەی سەرنج ڕاکێشەو خاوەن دوو چاوی سیحراویە ، جگە لەوەی لە ڕۆژنامەدا لە من زیاتر شارەزایە و ناوبانگی زۆرترە .. نا نابێت مێردەکەم بیناسێت یان بیبینێت ، لەوانەیە معجبی بێت ، بەڵکو دڵنیام ..
دیدی : لەیلا تۆ ژیریت .. ئەمە ژیری و سەلیقەییە . سوهێری کچم بە نیوەی تۆ ژیر نیە لەگەڵ ئەوەی لە کۆلیجی پزیشکیە .
لەیلا : ژیان شتێکی جیاوازە لە خوێندنی کۆلیجەکان .. من لە ژیان تێدەگەم چونکە تیایدا ژیاوم و بە دەستیەوە چەشتوومە و فێڵی خەڵکی دەزانم و لە کەس دڵنیا نیم ..
دیدی : تۆ ڕاست دەکەیت لەیلا .. وابزانم کامیلیا سەرجەم نهێنیەکانتی دەزانی و .. چیرۆکی خۆشەویستیەکەت لەگەڵ خالید .. لەیلا کەمێک بێدەنگ دەبێت و دەموچاوی دەگۆڕێت ..
لەیلا : بێگومان .. هیچمان لەیەکتر نەدەشاردەوە ..
دیدی : نەخێر لەیلا ، بە تەواوی پەیوەندیت لەگەڵی بپچڕێنە ..
لەیلا : ئێستا من ئەوەم کرد ..
دیدی : چۆن ؟
لەیلا : پێم نەوت شوو دەکەم .. بەڵام ئەو وتی لە هاوڕێیان لە ڕۆژنامەوە بیستویەتی کە شوو دەکەم ، لێی پرسیم کە ئایا زاوا خالیدە منیش وتم بەڵێ ئەوە ..
دیدی : درۆت لەگەڵ کرد ؟
لەیلا : بەڵێ ناچاربووم دەبوایە وام بکردایە ..
دیدی : بەڵام ئەو بەیانی ڕاستیەکان دەزانێت ..
لەیلا : ئەوە گرنگی بۆ من نیە ؟

دیـدی : لەوانەیە ڤینــی لێـت هەڵسـێت بەهـۆی هەڵـگەڕانەوەت و هەوڵبدات تۆڵەت لێبکاتەوە ..
لەیلا : نەخێر .. تۆ کامیلیا دەناسیت .. دڵـی زۆر باشـە .. هەرگیز ڤینی لە کەس نیەو بیر لە تۆڵە سەندنەوە ناکاتەوە چەند خراپ بیت بۆی .. من ئەو دڵ سافیەیم زۆرجار سوود لێ وەرگرتووە ..
دیدی : ئەو دڵ سـاف نـیە ، ئەو گێلە .. لای مـن دڵ سـافی و گێلـی وەك یەکە..
لەیلا : ( پێدەکەنێت ) پورە دیدی من معجبی ژیریتم ..
دیدی : ئێستا ناوی ئەوانی تر دەنوسین کە ماونەتەوە ..
لەیلا : ( کاغەزەکە دەگرێت بە دەستیەوە ) بەڵـێ .. کـاك عەزیـز و هاوسەرەکەی ..
دیدی : کاك عەزیز کێیە ؟
لەیلا : سەرنوسەری خۆمانە ..
دیدی : ئا .. بێگومان بێگومان ، ئەمە لە پێشی پێشەوەی میوانەکانە لەگەڵ هەمــــوو بەناوبانــــگ و دیارەکــــانی ڕۆژنامەکەتــــان و هاوسەرەکانیان ..
لەیلا : بێگومان هاوسەرەکانیشیان .. بە تەنها پیاوێک بانگ ناکەم تا مەحمود وابزانێت هاوڕێم بووە پێش شووکردنم ..
دیدی : ئەمە ڕاستە .. لەیلا زۆر ئاگات لە خۆت بێت ..
لەیلا : لێم مەترسە پورە دیدی ..
سـوهێری کچـی دیـدی دێـتە ژوورەوە .. سـڵاو لە لەیـلا دەکـات و دادەنیشێت و سەیری کاغەزەکانی سەر مێزەکە دەکات ..
سوهێر : ئەمە چیە ؟
دیدی : کارتی دەعوەتەکانی لەیلایە .. نوخشەت لێبێت سوهێر..
سوهێر : نا .. دایە تۆ دەزانیت شووکردن هیوای من نیە لە ژیاندا .. هیوام ئەوەی بەکالۆریۆسی پزیشکی وەربگرم و کاربکەم ..
دیدی : پاشان شوو بکەیت . کۆتایی کچ شووکردنە . وانیە لەیلا ؟

لەیلا : بێگومان .. کچ بۆ ئەوە دروست بووە تا شوو بکات .. پورە دیدی سوێندت بۆ دەخۆم من بەردەوام لە ژوورەکەم لە ڕۆژنامە دادەنیشتم و بیرم لەوە دەکردەوە کە تەمەنم گەیشتۆتە ( 27 ) ساڵ تا ئێستا کەس نەهاتۆتە پێشەوە لێم بۆ هاوسەری بوون .
هەرچەندیش بیرم دەکردەوە گەر بگەمە ( 30 ) ساڵی و بەبێ شوو بمێنمەوە سەرم دەسوڕا و خەریکبوو لەهۆشخۆم دەچووم ..
سوهێر : نا لەیلا .. تۆ لە بیری خۆتەوە بڕیار مەدە لەسەر شتەکان ..
لەیلا : من ڕاستی و دروست دەڵێم .. من زۆرجار خوازیاری ئەوە بووم کە نەم خوێندایە و کارم نەکردایە بەڵکو هەر لە تەمەنی ( 16 ) ساڵیەوە شووم بکردایە .. دەزانیت گەر ئەو کات شووم بکردایە ئێستا منداڵەکەم تەمەنی ( 10 ) ساڵان دەبوو !
دیدی : ڕاستە .. ئێوە لاوێتی و جوانترین تەمەنتان لە خوێندن و کۆلیجەکان بەفیڕۆ دەدەن ..
سوهێر : بەداخەوە لەیلا تۆ فێر نەبویت و نەتخوێندووە .. چونکە خوێندن دەرچوون نیە لە کۆلیجی ڕۆژنامەوانی و ببیتە ڕۆژنامە نووس .. خوێندن ئەوەیە کە لە بیری ئافرەتی نەزاندا دەرچیت ، ئەوانەی بڕوایان وایە کە ژیان مەحاڵە لە ژێر سێبەری پیاودا نەبێت ..
لەیلا : ئایا ئافرەت دەتوانێت بێ پیاو بژی ؟
سوهێر : بەڵێ .. ئافرەتی ڕۆشنبیری کارکەر دەتوانێت بێ پیاو بژی ، بە واتایەکی تر توانای خواردن و خۆ گۆڕین و ژیانی هەیە بێ پیاو .. کاتێک کە نەیدەتوانی ئەوانە بکات و لەسەر عەرەقی پیاو دەژیا .. پیاو خواردنی دەدایە پێویست بوو فەرمان بدات بەسەریدا .. بەڵام گەر خۆی خواردنی خۆی پەیدا بکات وەك ئەوی لێدێت ، هەر کاتێک ئارەزوت کرد ئەوکات دەتبینی ، جیاواز لەوەی کە هەر کاتێک ویستی دەبێت بیبینێت گەر بە ویستی خۆشی نەبێت ..

هەر کاتێکیش ویستی جێی بهێڵیت نەترسێت لە ڕووتی و برسێتی و جێی بهێڵێت ..
دیدی : ئەی هاوسەری بوون .. ئایا ئافرەت واز لە هاوسەری بوون بهێنیت ؟
سوهێر : نەخێر .. من وا نالێم .. بەڵام پێویستە شوو بە پیاوێک بکات خۆشی بوێت و منداڵی لێ دروست بکات ، نەك بۆ ئەوە شوو بکات نان بخوات و جلوبەرگ بپۆشێت .. هاوسەری بوون بە شێوازی یەکەم تەنها ڕێگەیە بۆ پەیڕەوکردنی خۆشەویستی تەواو ، بەڵام لە شێوازی دووەمدا ویستی ئافرەتێکی بەتاڵە بە شوێن خۆ سەرقاڵکردندا دەگەڕێت و یەکێک بیژێنێت ..
لەیلا : سوهێر منیش هەمان ئەم قسانەی تۆم دەکرد کاتێک خوێندکار بووم و لە تەمەنی تۆدا بووم .. بەڵام دوای ئەوەی بە ژیان و بە تایبەتی لە پیاو گەیشتم و تەواوی سەربەستی خۆمم پیادە کرد ، پێت دەڵێم ئەو کچەی شوو نەکاتە ئامانج و ویستی ڕێگە ون دەکات و بە هیلاك دەچێت و ڕۆژێك دێت خوازیاری ئەوەیە کە هەر جۆرە پیاوێک بێت و داوای هاوسەری بوونی لێبکات .. من لەگەڵتدام لەوەدا کە پێویستە ئافرەت ڕزگاری ببێت لە چنگی پیاو ، بەڵام چۆن ئازادبێت لەکاتێکدا ئەو ویست و ئارەزووی نەبێت ؟..
ژیانی ئافرەت لە دەستی پیاودایە ، شووکردنی ، جیابونەوە و تەڵاقی ، شەرەفی ، عەیبی ، کەرامەتی : هەمووی لە دەستی پیاودایە و کەی ویستی دەیداتە ئافرەت .. با وای دانێین تۆ کۆلیجت تەواو کردوو بویتە پزیشکێکی سەرکەوتوو و دیار ، ئایا دەتوانێت مێردت دەستنیشان بکەیت ؟
سوهێر : بێگومان ، ئەی بۆ نا ؟
لەیلا : لەبەرئەوەی ئەو تۆ دەستنیشان ناکات .. پیاو ئافرەت دەستنیشاندەکات و زۆرجار پیاو ئەو ئافرەتەی ناوێت کە ئافرەتەکە دەستنیشانی دەکات .. کەواتە ئەو پیاوەی تۆ دەتەوێت جێتدەهێڵێت ..

ئەو کاتە تۆ تەنها دوو ڕێگەت لە بەردەمدایە : دوای کەویت و کەرامەتت لەدەست بدەیت و بۆشت نەبێت .. یان چاوەڕوانی ئەو پیاوە بیت بێت بۆلات و لەگەڵ ئەوی بەدڵت نیە پێی قایل بیت .. کە ئەمە ئەو حاڵەتەیە ئافرەتی تێدابووە پێشئەوەی خوێندەواربێت و کار بکات ..
سوهێر : لەیلا ئەوە بێتوانایی و لاوازییە ئافرەتان لە دێر زەمانەوە وەك بۆماوەیی بۆیان ماوەتەوە لە سەردەمەکانی کۆیلایەتی .. پێویستە بیر و بۆچونەکانت بگۆڕیت ..
لەیلا : هەوڵمدا بیگۆڕم بەڵام ئاستەنگی زۆرم هاتە بەردەم .
خەریکبوو بەهۆیانەوە لەناو بچم ، دواجار خۆمدا بە دەستەوە ، سوهێر کۆمەڵگەی ئێمە تا ئێستاش بەو چاوە سەیری ئافرەت دەکات کە پێویستە لە پشتەوەی پیاوبێت نەك لە تەنیشتیەوە ..
دیدی : هەرچەند ئافرەت خۆی حەز دەکات بەردەوام پیاو لەپێشەوەی بێت و لەبەردەمیدابێت .
سوهێر : ئاخ .. ئەم وتوویژە هیچ سودێکی نیە . تەنها زەمەن پێویستە گۆڕانکاری بەسەر هاوکێشەکان بهێنێت و کۆمەڵگە بگۆڕێت و بیروبۆچونی هەریەك لە پیاو و ئافرەتیش لەگەڵیدا..
لەیلا : تاکو بیروبۆچوونی پیاو وئافرەتیش دەگۆڕێت پێویستە لە ئێستادا بژین ..
لەیلا : ( گاڵتەجاڕیانە ) .. دوای چەند ساڵێکی کەم بیر و بۆچوونت گۆڕانی بەسەردادێت .
سوهێر : مەحاڵە ..
لەیلا : نا نا .
دیدی : مێشکی وشکە تەواو وەك مێشکی باوکی ..
لەم کاتەدا مەحمودی دەزگیرانی لەیلا دێتە ژوورەوە ..
دیدی : بەخێربێیت محمود بەگ فەرموو ..
لەیلا : بەخێربێیت مەحمود ..

مەحمود تەوقە لەگەڵ لەیلا و سوهێر و دیدی دەكات ..
محمود : ئیوە چۆنن .. لەیلا تۆ چۆنیت ..
لەیلا : الحمدلله .. تۆ چۆنیت .
محمود : الحمدلله ..
دیدی : وتوویژیكی گرنگت سەبارەت بە پیاو و ئافرەت لە دەستچوو ..
سوهێر : بیرێكی باشە .. بۆ ڕای كاك محمود وەرنەگرین بەو پێیەی پیاوە ؟
محمود : ( بە پێكەنین ) بێگومان لایەنی پیاوان دەگرم ..
سوهێر : بڕوا ناكەم ، ئێستا تۆ دەڵێیت چی : ئایا هاوسەرگیری بۆ ئافرەت ویستە یان خۆشەویستی !؟..
محمود : پێویستە ئافرەت وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە ، بەڵام من دەتوانم بە حوكمی ئەزمونەكانی ژیانم بڵێم كە ئافرەت هەرچەند خوێندەوار بێت پێویستە ئامانجی هاوسەرگیری بێت .. ئەو بیر لە هاوسەرگیری دەكاتەوە پێش خۆشەویستی ..
لەیلا : لەبەرئەوەی پیاو حەقی تەواوی پێنادات لە خۆشەویستیدا ، ئەو بڕوای بە هیچ سۆز و خۆشەویستیەكی ئافرەت نیە گەر نەیبەستێتەوە بە هاوسەری بوون ..
محمود : باشە ئەو خودی خۆی بۆ حەقی خۆی نابات لە خۆشەویستی بە دەستی خۆی ، بۆ چاوەڕوانی پیاوبێت بڕوای پێی بێت یان بیداتێ یا بە پێچەوانەوە ..
سوهێر : ئەمە ڕاستە .. پێویستە ئافرەت بە دەستی خۆی مافی خۆی وەرگرێت .. پیاو مافی پێدان یان قەدەغەكردنی نیە ..
لەیلا : پیاو دادوەر و فەرمانڕەوا و شەرع و خاوەن جێبەجی كردن و سەرپەرشتیاری جێبەجێكارە .. كۆمەڵگەی ئێمە لە سەدا سەد كۆمەڵگەیەكی پیاوانەیە ..
سوهێر : ئەوە لەدێر زەماندا تێپەڕی كرد ..

لەیلا : تا ئەمڕۆش ماوە .. ئەو یاسایانەی کە ئەمڕۆ ئافرەت بە پیاوەوە دەبەستێتەوە هەمان ئەو یاسا کۆنانەن لە سەدان ساڵەوە دانراون و کاریان پێدەکریت ..
محمود : گەر ئەوە ڕاست بێت ئەوا من لۆمەی ئافرەت دەکەم چەند خوێندەواربێت ، چونکە بەردەوام دڵی بەلای کۆیلایەتیدایە .. بەلای ئەوەی کە پیاو گەورە و پارێزگاری بێت..
لەیلا : محمود ئەوە سروشتی مێینەیە .. ناتوانین بەرەنگاری سروشت بینەوە ..
سوهێر : نەخێر سروشت نیە .؟. بەڵکو خووە . ئافرەت خۆی لەسەر ئەوە ڕاهێناوە لاواز و سست بێت و چێژ لە فەرمان و دەسەڵاتی پیاو وەرگرێت..
محمود : گەر ئافرەت ئەو خوە بگۆڕێت ئەوا پیاویش چاری نامێنێت ئەویش دەگۆڕێت ..
لەیلا : ئافرەت ناتوانێت خۆی بگۆڕێت ..
سوهێر : بەڵکو دەتوانێت ..
محمود : ئەمە دەکەوێتەوە سەر توانای ئەو ئافرەتە بەتوانا بێت یا لاواز .
سوهێر : ئافرەتی بە توانا دەتوانێت .
لەیلا : ئافرەت بە تواناو هێزەوە دەستپێدەکات و گەر چووە ئەزمونێکەوە بە لاوازی دێتە دەرەوە .. ئێستا و واقیع ئەوە دەسەلمێنێت تا چەند ئافرەت سست دەبێت و دەیگۆڕێت ..
سوهێر : ئەمە ڕاست نیە ..
لەیلا : سوهێر تۆ ناتوانیت حوکم بدەیت .. تۆ هێشتا نەچویتە ئەو ئەزمونەوە ..
محمود : ئەی لەیلا تۆ چویتە ئەو ئەزمونەوە ؟
لەیلا کەمێک بیردەکاتەوە و پاشان بەپاکی خۆی نیشاندەدات و دەڵێت .

بێگومان نەخێر ..
کەمێک بێدەنگی باڵ دەکێشێت بەسەر دانیشتنەکەدا .
محمود : کەواتە تۆ ناتوانیت حوکم بدەیت ..
لەیلا : ( بە سادەییەکەوە لەگەڵ ئەو ڕایەدایە ) بێگومان من ناتوانم حوکم بدەم .
محمود بە گومانەوە لێی ورد دەبێتەوە .
سوهێر : با وای دابنێین چۆتە ئەو ئەزمونەوە ، ئایا ئەمە نیگەرانت دەکات ؟
محمود بیردەکاتەوە و سەیرێکی لەیلا دەکات ، لەیلاش خۆی لێ دەدزێتەوە .
محمود : ( بە پەشۆکاوی ) نا . نا بێزارم ناکات .
سوهێر و لەیلا دەزانن کە درۆ دەکات بەڵام وا خۆیان نیشان دەدەن کە بڕوای پێدەکەن .
ماوەیەکی بێدەنگی درێژ تێدەپەڕێت ..
سوهێر : تۆ ڕاستی ناڵێیت .
لەیلا : نەخێر ، ئەو ڕاستی دەڵێت ، سوهێر تکایە ئەو باسە بگۆڕە کاتەکەی هەموو بەفیڕۆداین .
سوهێر دەچێتە بیرێکی قوڵەوە .
دیدی : ببینە محمود بەگ . کارتەکانت بینیوە ؟ ڕات چۆنە ؟
محمود : زۆر جوانن . ئەی ئەم ناوانە چین ؟ میوانەکانن .
محمود کەمێک لەو کاغەزە ورد دەبێتەوە کە ناوەکانی تێدایە .
دیدی : هاوڕێکانی لەیلا هەموو پایە بەرز و خەڵکی خاوەن کەسێتین .
محمود لەبەر خۆیەوە بەردەوام دەبێت بە خوێندنەوەی ناوەکان .
محمود : ئەی کوا ناوی کامیلیا ؟..
لەیلا : ( بەسەرسورِماوی ) کامیلیا ؟ دەیناسیت ؟
محمود : نەخێر ئەمڕۆ ناسیم ..

لەیلا : ( بە پەشۆکاوی ) ئەمڕۆ ؟ کەی ؟
محمود : ئەمڕۆ چوومە ڕۆژنامە بۆلات وامزانی لەوێیت بەڵام هاوڕێیەکتم ناسی ناوی کامیلیا بوو ..
لەیلا : ئەی چی پێ وتیت ؟
محمود : هیچ . کاتێک هەواڵی تۆم لێ پرسی ڕێزی گرتم و داینیشاندم و قاوەیەکیشی بۆ بانگ کردم و وتی کە تۆ هاوڕێیەکی خۆشەویستی ئەوی ..
دیدی : ئەو وا خۆی نیشاندەدات . ئەو هاوڕێی لەیلا نیە . تەنها لە ڕۆژنامە هاوڕێیەتی ..
سوهێر : دایە ئەوە تۆ چی دەڵێیت ؟
لەیلا : ڕۆژێك لە ڕۆژان هاوڕێم بووە ، بەڵام ڕەوشتیم بە دڵ نەبوو لەبەرئەوە ..
سوهێر : چیییی ؟ من یەکەمجارە ئەم قسانەم گوێ لێ دەبێت..
دیدی : سوهێر تۆ بێدەنگ بە . تۆ هیچ نازانیت . بچۆرە ژورەکەی خۆت و سەعیەکەت بکە . کاتێکی زۆرت بە فیرِۆدا .
سوهێر دەچێتە دەرەوە بە سەرسورِماوی توڕەییەوە ..
محمود سەر دادەخات بەبێدەنگی و دەچێتە بیرێکی قوڵەوە .
دیدی : محمود بەگ هەستە ، لەوانەیە برسیت بێت . بابچین نان بخۆین . هەستە لەیلا ، واز لەم قسە پڕ و پوچانە بێنن .
لەیلا : چیت لێناوە پورە دیدی ؟
دیدی : کەروێشك زۆر خۆشە . محمود بەگ فەرموو .
لە محمود نزیك دەبێتەوە و دەستی دەگرێت و دەچنە دەرەوە .
لەیلا بە تەنها دەمێنێتەوە و دەستی دەگرێت بە سەریەوە و دەچێتە بیرێکی قوڵەوە . سوهێر دێتە ژوورەوە .
سوهێر : من هیچ تێناگەم .

لەیلا : ( سەری بەرزدەکاتەوە و بەڕەقی دەڵێت ) : پێویست ناکات لەهیچ تێبگەیت . بەڵام ئەوە بزانە کە هەڵەیت ! با بگەیتە تەمەنی من بۆت ڕوون دەبێتەوە دوای ( 10 ) ساڵی تر .

سوهێر : من وا هەستم دەکرد کە ئەو ساڵانەی دەچنە سەر تەمەنم لە هێز و توانام زیاد دەکەن بەردەوام .

لەیلا : بەپێچەوانەوە . لاوازی و ترس و ویستت بۆ پیاو زیاتر دەکات ، ئافرەت لە ( 30 ) ساڵی تەمەنیدا لاوازترە وەك لە ( 20 ) ساڵدا .

سوهێر : نا . نا لەیلا . حەز و ویستت بۆ هاوسەرگیری و شوکردن زۆرێک لە ڕاستیەکانی لێ شاردویتەوە .

لەیلا : سوهێر . کۆمەڵگە بە تەنها بڕوا بە ئافرەت ناکات . بەردەوام دەپرسێت بۆچی شووی نەکردووە ؟

سوهێر : ( بە تووڕەییەوە ) کۆمەڵگە ! کۆمەڵگە ! من دان بەم کۆمەڵگەیەدا نانێم !

لەیلا : ( پێدەکەنێت ) ها ها ها ها ها . هەڵدەسێت و دەستی سوهێر دەگرێت .

برِۆ بابرۆین . برِۆ سوهێر با کەروێشك بخۆین . محمود و پورە دیدی پێشمان کەوتن برِۆ .

سوهێر : ( دەوەستێت و بە متمانەوە دەڵێت ) : من ناگۆڕێم لەیلا . ناگۆڕێم !

لەیلا : پێویست ناکات لەسەر شتێک بدوێین هێشتا نەهاتووە . کەس نازانێت پاشە ڕۆژ چی ڕودەدات . بەڵام من ئێستا شوو بە محمود دەکەم ، پێویستە شووی پێبکەم ، و پێویستیشە پارێزگاری لێبکەم من لە ( 30 ) ساڵی نزیك بومەتەوە ، ناتوانم بێ پیاویش بژیم . تێگەیشتیت ؟

سوهێر : ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە درۆ لەگەڵ خۆشت و ئەویش بکەیت ؟

لەیلا : ڕاستگۆیی لە ژیانی ئافرەتدا مەترسیدارترە لە ژیانی .
ئافرەتی ڕاستگۆ بەد بەخت ترین ئافرەتە لە ژیانیدا و ناتوانێت لەگەڵ پیاودا بژی .

سوهێر : ئەمە چۆن ؟

لەیلا : پیاو پێی باشە بڕوا بە درۆکانی ئافرەت بکات و ناشزانێت کە درۆیە ، پێی باشترە لەوەی کە ڕاستگۆبێت لەگەڵی .

سوهێر بیرێکی سەیر دەیباتەوە ..

سوهێر : کێشەکە کێشەی پیاوە .

لەیلا : دواجار تێگەیشتیت .. تێگەیشتیت !

دیدی بە پرتاو دێتە ژوورەوە ..

دیدی : لەیلا ؟ سوهێر ؟ ئیوە بە تەنها لێرە دانیشتوون و محمود بەگیش بە تەنها لەسەر سفرەکە چاوەڕوانتانە ؟ خێرا خێرا خواردنەکە سارد دەبێتەوە .

هەموو دەچنە دەرەوە .

( پەردە )

# نــادیە .. نەمتوانی !

پێڵوەکـــانی هەڵگلۆفـــت و خـــۆی کێشـــایەوە ، هەســـتی بە حەوانەوەیەك کــرد رۆح و جەســتەی دادەگرێــت .. ئەو حەوانەوە سـەیرەی لەنێـوانی سـاتی خەواڵـویی و بەئاگاییدا ڕودەدات کاتێـک مێشکی شاراوە دەچێتە خەوەوە و مێشکی بەئاگاش هێشتا خەبەری نەبۆتەوە ..

لەو ساتوەختە ناسکەدا خۆی کێشایەوە ، ڕاکردوو لە دەست هەردوو کــات و شــوێن ، ون بــوو لە نێــوانی بەئاگــایی و بــێ ئاگــایی .. هەستیکرد ڕزگـاری بـووە لە هەردوو مێشـکەکە .. و ویژدانــی لە قورسـاییان ئـازاد بـووە و هەسـتیکرد هێنـدەی پەڕێـک وەك بلـور سوکەڵە بووە ..

لێوەکانی بە شادیەکی بێ سنورەوە کرانەوە تا چەند وشـەیەکی لێوە بینـە دەرەوە وەك شـەکر ، هەسـتی بە تـاڵی ڕاسـتی کـرد جەسـتە و رۆحــی کــون دەکــات لەگەڵ ئەو دەنــگە ناخۆشــەی دەیـوت : نــانی بەیــانی ئامــادەیە , چاوەکــانی کــردەوە ، قوڵەکــانی بەرزکــردەوە و بەسـەر جێگەکەدا گێڕایـی و لێـواری سـەرچەفەکەی تونـد گـرت تـا بزانێت لە واقعدایە و پاشـان چرنـوکێکی لە قـاچی گـرت تـا دڵنیابێت لەوەی کە خودی خۆیەتی . گـوێی لێبـوو دوبـارەی کـردەوە : نـانەکە ئامــادەیە ، ماسـولکەکانی دەموچــاوی خەنــدەیەکیان کــرد وەك ئەوە وابوو دەموچاو بدات بەیەکدا .. بۆچی بە ناوی خۆی بانگی ناکات ؟ لەوانـەیە وەك ئەو وابێت .. لەلێواری زمانیدا وشـەکانی نـاوێکی تـر هەبێت و توانـای خلیسـکانی نـەبێت لەنێـوان لێوەکـانی. یـان لەوانـەیە

شەرم بکات .. بەڵام ئایا دەکرێت شەرم بێت دوای ئەو هەمووەی لەنێوانیاندا شەوێ ڕویداوە ؟
خۆی کێشایەوە و وتی : سوپاس ... ویستی ناوەکەی بڵێت و بڵێت سوپاس ( علیە ) بەڵام نەیتوانی ، چونکە هەردوو مێشکی بەئاگاو بێ ئاگای تەنها وشەکانی ناوی ( نادیە ) یان دەرخ بوو .. ناوەکانی ئافرەتانێکی زۆر چوونەتە گوێچکەکانی بەڵام بێئەوەی هیچکامیان بتوانن بچنە مێشکیەوە.
هەستی بە دەستی ناسکی بوکەکەی کرد کە دوێنی شەو بۆتە هاوسەری شانی گرت و بە دەنگێکی سەیرەوە وتی ( نانی بەیانی ئامادەیە ... ) .. چاوەکانی کردەوە و قۆڵە ناسکەکانی بینی کە سوور بووبونەوە لە ئەنجامی شوێنەواری هەڵکێشانی موەکان بەم نزیکانە دیارە .. خەندەیەکی گەورەی کردوو و تی: سوپاس ... سەرجەم ماسولکەکانی مێشک و زمانی کۆکردەوە تا بڵێت ( سوپاس علیە ) بەڵام نەیتوانی .
کاتێک لای کردەوە بینی کراسێکی تەنکی لەبەردایە هەستی بە دڵ تێکەڵهاتن کرد وەك چۆن لە لاوێتیدا هەمان ئەو هەستەی لا دروست دەبوو کاتێک سۆزانیەك لەبەردەمیدا خۆی ڕووت دەکردەوە لەو ساتەی پێی دەخستە ناو دەرگای ژوورەکەی .. ئەو دڵ تێکەڵهاتنەی تەواوی جەستە و رۆحی بە فیرِۆ دەدا و لە پیاوێتی دەخست و وەك مردویەکی لێدەکرد .
سەرنجی هاوسەرەکەیدا کە بە نیمچە ڕوتیەك بەبەردەمیدا دێت و دەچێت ، پرسی : ئایا دەشێت ئەمە هەر هەمان ئەو ئافرەتە شەرمنە بێت کە پێش دوو ڕۆژ لە ماڵی باوکی کاتێک سینیەك قاوەی هێنا و چاوەکانی داخست ؟ ئایا دەکرێت ئافرەتێکی لەو شێوەیە جلوبەرگەکەی لەبەردەم پیاوێکدا دانێت پێشئەوەی پێشتر بینیبێتی یان ناسیبێتی ؟ ئایا جیاوازی نێوان ئەم و ئافرەتێکی سۆزانی چیە ؟ هەردوکیان لە بەردەم پیاوێکی بیگانەدا خۆیان ڕوتکردەوە لەپێناو

کاغەزێکی بچوکدا .. سۆزانی دەستبەجێ کاغەزەکەی دەدڕێتێ ، بەڵام هاوسەر لە پاشینەدا دەیدڕێتێ .. و هەر ئافرەتێک نرخی خۆیی هەیە .. گران یاخود هەرزان .. لە پێشەوە بدرێت یان لە دواییدا .. بەڵام نادیە .. تەنها ئەو بوو نەیزانی نرخی چەندە .. داواکاریەکانی ئەو لە داواکاری ئافرەتان نەدەچوو .. ئەو قینی لە دیاری بوو ، قینیشی لە جلوبەرگ و خشڵ بوو .. هیچ کاتێکیش ڕێزی بۆ کاغەز و خشڵ دانەناوە .

هاوسەرەکەی بینی دەستی کردە ملی و بۆن و بەرامی عەتر گەیشتە ناخی لوتی تێکەڵ بە بۆن و بەرامی جەستەیی و رۆحی ، هەستی بە سەرسورِمان کرد لە گشت لایەکەوە ، بەڵام بە دڵنیایەوە دەستی کردە ملی.. چونکە دەیزانی چی دڵشادی دەکات و دەتوانێت بەردەوام دڵشادی بکات بەبێ خەم .. هەستیکرد وەك سابونێکی نەرم لایەوە ڕاکشا .. و گەرمی جەستەیی پێگەیشت ، جەستەی ئافرەت قایلی دەکات و دەجوڵێنێت . بەڵام نادیە هزری دەهەژاند ، رۆح و جەستەی دەکوڵاند .. و ڕاپەڕینێکی گەورە دایدەگرت و غروری گەورەی لەناو دەبرد ..

# پێشکەش

زۆرجار ئازارم چەشتووە ، بەڵام هیچ ئازارێکم هێندەی ئەو ئازارە ناخۆش نەبووە لام کاتێک درۆم لەگەڵ خۆمدا کردووە ... زۆرجاریش شادمان بووم بەڵام ، هیچ شادومانیەکشم نەگەیشتۆتە ئاستی شادومانیم کاتێک ساتێک بەڕاستگۆیی لەگەڵ خۆم ژیاوم .

ڕاستی هەرچیەکە با ببێت ، بەڵام لە قوڵایی ناخیدا بە شتێکی سیحراویدا دەشکێتەوە ، ، شتێکە بۆمان ئاشکرا نابێت تاکو بەرەنگاری نەبینەوە لە ساتوەختێکی ڕاستگۆییدا .

لەبەرئەوە بۆ هەموو کەسێک کە چێژی ڕاستگۆیی لەگەڵ خۆی چەشتووە ... و بۆ هەرکەسێک کە ئەو چێژەی لەدەست خۆیداوە ، ئەم کۆمەڵە ساتوەختە پێشکەش .

نەوال سەعداوی



jivarakamal@hotmail.com



# MOMENT OF TRUTH

زۆرجار ئازارم چەشتووە, بەڵام هیچ ئازاریکم هیندەی
ئەو ئازارە ناخۆش نەبووە لام کە کاتیک درۆم لەگەل
خۆمدا کردووە زۆرجاریش شادومان بووم بەڵام, هیچ
شادومانیەکیشم نەگەیشتۆتە ئاستی شادومانیم کاتیک
ساتیک بە ڕاستگۆیی لەگەل خۆم ژیاوم
ڕاستی هەرچیەکە با ببیت, بەڵام لە قوڵایی ناخیدا بە
شتیکی سیحراویدا دەشکیتەوە, شتیکە بۆمان ئاشکرا
نابیت تاکو بەرەنگاری نەبینەوە لە ساتوەختیکی
ڕاستگۆییدا ..